## لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە ٢٩٣

## ناسنامەی کتێب



**بەناوبانگترین تاوانەکانی سەردەم**


harem yasin

وەرگێڕانی: هێمن کەرکوکی

بابەت: ڕووداو

نەخشەسازی ناوەوە: هەرێم یاسین

بەرگ: فواد کەولتوسی

تیراژ: ١٠٠٠

نۆبەت و ساڵی چاپ: دووەم ، ٢٠١٣

شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردنی: ٢٥٩١ی ساڵی ٢٠١٠ی پێدراوە.



ناونیشان

سلێمانی ـــ بازاڕی سلێمانی ـــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)

# ناوەڕۆك

– مۆبایل و کێشەی نێوان ژن ومێرد!

– بە چەند دۆلارێکی ئەمریکی فیلمێکی عەرەبی سێکسی دەرئەهێنن

– کاتێك مرۆڤ خۆی وپەیامەکەی لە ژیان لە بیر ئەکات چی روو ئەدات؟!

– دیاردەی بوونی خزمەتکار لە نێو ماڵاندا چی لێ ئەکەوێتەوە؟

–بەدڕەوشتی لە لای عەرەبی سعوودی لە پەرەسەندندایە!

–فاڵچییەکی مەغریبی دەست درێژی سێکسی ئەکاتە سەر کچەکەی

– ژنێك ڤێلاکەی ئەکاتە شوێنی لەشفرۆشی

–بەرپرسی نەخۆشخانەیەك لەگەڵ یەکێك لە ناخۆشەکانیدا بەرووتی دەست گیر ئەکرێن

–کچێکی ١٧ساڵ دان بە تاوانەکانیدا ئەنێ!

– کرێکارێکی بەنگلادیشی لە جدە کچێکی حەوت ساڵ لاقە ئەکات

– بچووکی تەمەنی قۆرخ کرد بۆ کاری سێکسی

–خێزانێك فشار ئەخاتە سەر خزمەتکارێکی ماڵەوەیان بۆ کاری سێکسی

– بووکێك بە کۆمپیوتەر لە هەفتەی یەکەمی زەواجیدا خیانەت لە مێردەکەی ئەکات

- ژنێکی سعوودی بە درۆ وفێڵ و ساختە کۆمەڵگای سعوودی دەهەژێنێ

-چووکی هاوسێکەی قرتاند کە کاتێك ویستی دەست درێژی لێ بکات

- هاوڕێەتیەکی ئیلکترۆنی بە لاقە کردنی منداڵێکی پانزە ساڵ کۆتایی دێت

-هەشت کەس دەست درێژی سێکسی دەر حەق بە خزمەتکارێکی فیلیپینی ئەنجامدەدن

- لە پاکستان تۆڵەسەندنەوەی شەرەف چۆنە؟؟

-بڕیاری لە سێدارەدانی تاوانبارانی ئەتککەرانی کچە پاکستانی بیبی دەرچوو

-کچێکی کوێتی بۆ چەند جارێك براکەی سێکسی لەگەڵ ئەکات (خوایە تۆبە)

-گەنجێکی هیندی نەنکی خۆی دەخوازێت

- ژنێکی تورکی لە ناوەندی ئیستانبول دەکوژرێت بە پاساوی پاراستنی شەرەف

- باوکێکی ئیسرائیلی دەست درێژی سێکسی ئەکاتە سەر کچەکەی

-کۆتایەکی پڕ تراژیدیا لە چیرۆکێکی خۆشەویستیدا

- پیاوێکی میسری جوانی ژنەکەی بەکار دێنێت بۆ کاری ساختەو دزی

-هاوسەرەکەی پێی وت دووگیانم ئەویش بێ ڕەحمانە کوشتی

- پیاوێکی لوبنانی ژنەکەی وکچەکەی دەکوژێ بە پاساوی پاراستنی شەرەف

-لاقە کردن ورفاندنی بووکێك لە سەر ڕێگایەکی گشتی

-شەوێکیان لەگەڵ برادەرەکانم لە یەکێك لە ئاهەنگەکان ئەهاتینەوە؟!

-قەت بیستووتە برا خوشکی خۆی لاقە بکات؟! یا دایك کاری لەشفرۆشی پێوەبکات؟! (خودایە خۆت ئاگارداری).

-کچێکی ئەڵمانی لەبەر چاوی خەڵکی لاقە ئەکرێت و کەسیش هەوڵی ڕزگاربوونی نادا

-ئیدانەکردنی هاولاتییەکی بەریتانی بە تۆمەتی هەڕەشەکردن لە کچێکی کەنەدی لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە

-منداڵێکی میسری لە کاتی خەتەنەکردنیدا ئەندامی نێرینەی بە تەواوەتی لە دەست ئەچێت

-تاوانەکەی هەر دوو خوشکی میسری رییا وسەکینە وهەژاندنی کۆمەڵگای میسری

- تاوانی دەست درێژی سێکسی لە ناوهێزەکانی ئەمریکادا لە چ ئاستێکدایە؟

## پێشەکی

مرۆڤ جوانترین بوونەوەری سەر رووی زەوییە، پلەی لە هەموو بوونەوەرەکانی تر بەرزترە، تەنانەت لە فریشتەکانیش! بەلاّم کاتێك مرۆڤ تاوان ئەنجام ئەدات ئەم جوانی و پلەو پاك وبێگەردییەی خۆی لە دەست ئەدا،داخۆ ئەبێ تاوانکردن چەند بە زیانبێ بۆ مرۆڤ؟ بۆیە لێرەدا دەمەوێت باسی تاوان و نموونەی بەناوبانگترین تاوانەکانی ئەم سەردەمە بهێنمەوە، بەتایبەتی تاوانەکانی دەست درێژی کردنی سێکسی بۆ سەر ژنان و منداڵان و کچ و کورە هەرزەکارەکانمان، زۆرێك هەن لە تەمەنێکی بچوکدا دەست درێژی سێکسیان دەرحەق ئەنجام دەدرێت ئەویش بەزۆر وفشارخستنەسەر لە لایەن کەسانی دوور لە کەسەکە یاخود نزیك. هاتنە کایەی بوارە پێشکەوتۆکانی ئەمڕۆی سەدەی بیست ویەك چەند بە سوود بوو بۆ مرۆڤایەتی ئەوەندەش زیانی گەیاند، ئەویش لە ئەنجامی خراپ بەکارهێنانی هەموو ئەو ئامێرە دوور بێژانەی ئەمڕۆ.

لە میانەی کارکردنم لە بواری رۆژنامەنووسیدا کۆمەڵێك نامەم بەدەست دەگەیشت کە کەسانێك باسی چیرۆکی پڕ ناخۆشی ژیانی خۆیان بۆ دەگێرامەوە، لە ئاستی سەختی رووداوەکاندا عەقڵم رادەوەستا تا ئەو رادەیەی نەمدەزانی بەم رێژە زۆرە دەست درێژی هەیە لە کۆمەڵگاکەمدا بەتایبەتی دەست درێژی سێکسی بۆ سەر منداڵان کە هەندێکیان باسیان لەوە ئەکرد مامۆستاکانیان دەست دێژی سێکسیان کردوونەتە سەر، یان هاوڕێ و هاوەڵی خۆیان بوون، یاخود خزمەتکاری نێوماڵەکانیان، ئەمە بەراستی ئازارێکی سەختە. لە

بەرامبەردا دایكو باوك نازانن چ کارێك ئەنجام بدەن لە بەرامبەر روودانی تاوانێکی لەم جۆرە دژ بە منداڵەکانیان ئەگەربێتو لایەنی پەیوەندیدار ئاگادار بکەنەوە ئەوا لە بەرامبەردا لە ناو خەڵکیو هاوەڵەکانیاندا ئابروویان دەچێت .

باوکێك هاتەلام لە بارێکی دەروونی زۆر سەختدا بوو کاتێك بیستی کورەکەی دەستدرێژی خراوتە سەر سەرسام بوو نەیدەزانی چی بکات، ئەگەر لایەنی ئاسایش وپەیوەندیدار ئاگادار بکاتەوە ئەوا هەست بەخەجاڵەتییەکی زۆر ئەکات لە کاتی لێکۆڵینەوەدا لەو، ئەگەر هاتوو سکاڵاشی دژی ئەو کەسانە تۆمار کرد، کە چی دەبینی بە کۆمەڵێك کاری سەختەیی ئازاد کراوە بە بێ سزادانی.

منداڵ کاتێك کارێکی لەم جۆرە لەگەڵیدا ئەنجام دەدریت زۆربەی کات بە پێی ئەزموون ئەو داتایانەی کە ئەمرۆ لە بەر دەست دایە لە لایەن کەسانی نزیکی خۆیەوە دەست درێژیکە دەر حەقی ئەنجام دەدرێت منداڵەکەش لە ترسی ئابروو چوونی خۆی هیچ کەسێك لە ئەندامانیماڵەوەی ئاگادار ناکاتەوە، چونکە ڕەنگە بڕوای پێ نەکەن بۆیە دەیشارێتەوە ئەمەش ئەبێتە هۆی دووبارە بوونەوەی کارەکە لە لایەن هەمان کەسەوە یان هەندێك جار ئەو کەس هەرەشەی لێئەکات بە کوشتنو ئازاردانی ئەویش لە ترسا بێ دەنگ ئەبێ.

منداڵ کاتێك تووشی ئەم حاڵەتە ئەبێ تووشی زمان بەستنێکی کاتی دێت ئەویش لە ئەنجامی شۆكو سەرسام بوونی بەم کارە نامرۆڤایەتییە، ئەمەش وائەکات بۆ ماوەیەك تووشی کەئابەیەکی توند بێتو هەمیشە لە ئازارێکی دەروونیدا بژی بە تایبەتی لە کۆمەڵگای رۆژهەلاتیدا کە نامۆیە بەم جۆرە کارانە.

خێزانی ئەو کەسەی دەست درێـژی سێکسی دەرحەق ئەنجام دراوە هەمیـشە لـە نارەحەتیـدا دەژیـن بـەڵکو ئـازارە دەروونیـکـە لـەلای خێزانەکەی سەختره، باوکێکم بینی کورەکەی تەمەنی حەوت ساڵ بوو دەسـت دیـژی سێکسی کرابۆسـەر لـە لایـەن یـەکێك لـە کرێکارەکـانی پرۆژەی ئاوی نەخۆشخانەیەکەوە کە بە ڕگەز بیانی بوو، باوکی دەگریا فرمێسك بە چاوەکانی دەهاتـە خـوار باوکەکـە وەك شێرێکی بەندکراو نەیـدەزانی چـی بکـات، زۆر تـووڕە ببـوو دەیەویـست پەلـەماری ئـەو تاوانبـارە بـداو بیکـوژێ ئـەو تاوانبـارەی بەرائـەتی کوڕەکـەی شێواند، بەلاٌم تاونبار خۆی دایە دەستی پۆلیس لە ترسی ئەوەی نەکا باوکی بیکـوژێ، بـەلاٌم چ فایـدە پـاش ماوەیـەك ڕەوانـەی ولاٌتەکـەی خـۆی ئەکرێتەوەو بۆ ساڵێکی تر بە پاسەپۆرتێکی ساختە دێتەوە ناو ولاٌت .

خزمەتکارەکانی ناو ماڵەکان یەکێکن لەو هۆکارانەی تر بەتایبەتی بۆ کوری بچووکی نێو ماڵ، چونکە کچان زیاتر بایـەخ و پارێزگارییـان لێ دەکـرێ بـۆ نموونـە نـاهێڵن لەگـەڵ شـۆفێرەکەی ماڵـەوە بـە تـەنها سەرکەوێت بەلاٌم بۆ کور هەر چەندە منداڵیش بێت تاڕادەیـەك ئاسابیە بەلایەنـەوە بـەلاٌم بۆکـچەکانیان ئەگـەر لەگـەڵ خۆیانـدا نـەبێت نـاهێڵن لـە کەڵ شۆفێرەکەیاندا دەرچێت.

بێگومـان هـەموو مرۆڤێـك لـە منداڵییـەوە کەسایەتی خـۆی هەیـە ئـەم کەسـایەتییەش پێویـستە بـەهێز بێـت بـەلاٌم کاتێـك جۆرێـك لـەم کـارە لەگەڵیدا ئەنجام دەدرێت ئەوا کاریگەری ئەو کارە لەسەردەروونی بەجێ دەمێنێـت کاتێـك کـە گـەورەش ئـەبێت بەهەمانـشێوە دەروونـی ئـازار ئەدات.

نامەیـەکم بـە دەست گەیـشت لـە ڕێگـەی پۆسـتی (کلینکی ریان)ه وە

گەنجیەك باس لە ڕووداوێکی دەست درێژی سێکسی ئەکات کە کاتێك منداڵ بوووە تا تەمەنی هەرزەکاریش هەر ئەم کارەیان لەگەڵ کردووە تا ئەوکاتەی تەمەنی بووە بە بیست ساڵ ئیستا گەنجێکی تەواوە بەڵام هەمیشە لە ڕووی دەروونییەوە بیری لێئەکاتەوەو متمانەی بە خۆی نەماوە پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام بدات بەڵکو هەندێك کات وا هەست ئەکات پیاوەتیشی لە دەست دابێ ئەمەش تاوانێکی بەراستی گەورەیە،گەنجێك لەم تەمەنەدا تووشی کۆمەڵێك نارەحەتی دەروونی بێت بەراستی کارەساتە هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ کەم تەرخەمی خێزانی لە پشت گوێ خستنی بە پلە یەك بەڵام بە پلە دوو مامۆستاو قوتابخانە بەر پرسیارن لەبەردەم فەرامۆش کردنی هەندێك لایەنی پەروەردەیی تایبەت بە منداڵ ئەمانە هەمووی ڕۆڵی خۆیان دەبینن لە دووروستکردنی کەسایەتی منداڵ .

لە ڕاستیدا منداڵ دیارییەکی جوانە خوای گەورە بە مرۆڤەکانی دەبەخشێت ئەمانەتێکە پێویستە دایكو باوك پارێزگاری لێ بکەن وئاگاداری بن و لەسەر ڕەوشتو بەرنامەی جوان پەروەردەی بکەن بەتایبەتی لە قۆناغی هەرزەکاریدا کە قۆناغێکی هەستیارە بۆ هەموو تاکێك هەر، بۆیە دایكو باوكو مامۆستاو قوتابخانەو دەوڵەت بەرپرسیارن لە خراب بوونی ڕەوشتو کرداری هەر تاکێکی کۆمەڵگا.

ڕەوشت بناغەی کۆمەڵگا دادەنێ ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە باشو خراپی ڕەوشی وڵاتدا، کاتێك کۆمەڵێك تاکی ڕەوشت بەرزمان هەبوو ئەوکات بارووداۆخی وڵاتو خێزانو کۆمەڵگاش بە ئاراستەیەکی تردا دەڕوات ناکرێت کۆمەڵگایەك سەرکەوێتو بگاتە لوتکەی بەختەوەری بەبێ ڕەوشتی بەرز، ڕەوشتیش لە کوێوە دەست پێ ئەکات بێگومان لە

منداڵیەوە کە بەردی بناغەی کەسایەتی دادەنیٚ، هەر بۆیە زانایانی بواری فەلسەفە دەڵیٚن: مەئساتی مرۆڤ لەوەو دەست پیٚ ئەکات کە لە ئەسڵدا منداڵە.

بێگومان قۆناغی منداڵی قۆناغێکی هەستیارو ناسکە سەرەتا هەموو شتەکان لێرەوە دەست پیٚ ئەکەن ئەگەر هاتوو مرۆڤێك ژینگەی پەروەرئەکردنەکەی ژینگەیەکی لە بارو ساغ بوو ئەوا بێگومان تاکێکی رەوشت بەرز دووروست ئەبیٚ هەر بۆیە پاراستنی منداڵ لە هەر کۆمەڵکایەکدا بەرپرسیارێتێکی یاسایی‌و تەشریعییە ئەگەر هاتوو یەکەیەکی پاراستن هەبوو لە دام دەزگای حکومەتدا بۆ پاراستی منداڵ ئەوا لەو تەنگ‌و چەڵەمانەی کە لەو قۆناغەدا رووبەرووی ئەبێتەوە رزگاری ئەبێت، لە ئەنجامدا تاکێکی پاك‌و بێگەرد لە ولآتدا دووروست ئەبیٚ ئەبێت لەبەرامبەر ئەمشدا کۆمەڵێك رێکخروا هاوکاری خێزان بکەن بۆ پەروەرئەکردنی منداڵ بە شێوەیەکی تەندووروست‌و ساغ‌و هەوڵ بدەن بۆ گەشەکردنی داهێنانی دەستی‌و بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی منداڵ، چونکە بەڕاستی ئەوەندەی تێبینی دەکریٚ لەگەڵ پێشکەوتنی ژیان‌و گوزەرانی خەڵکی کە چی تاوانەکان روو لە زیاد بووندان، ئەویش بەهۆی نەبوونی هۆشیاری رۆشنبیری‌و کەم تەرخەمی خێزان‌و ماڵ وقوتابخانەو مامۆستاو حکومەت‌و دەوڵەت هەموو ئەم لایەنانە بەرپرسارن لە بەدەم باش‌و خراپی تاکەکانی کۆمەڵگادا، چونکە پێکهاتەی کۆمەلآیەتی لە تاکەکانی کۆمەڵگا پێك دێت ئەگەر هاتوو پێکهاتەکانی کۆمەڵگا تێکچوو ئەوا تاکەکانیش بە رەو ئاراستەیەکی خراپ دەڕۆن هەر بۆیە لێرەدا کۆمەڵێك چیرۆك‌و بەسەرهاتی دەست درێژی سێکسی دەخەینەروو کە لە سەر تاسەری

جیهاندا روویانداوە مرۆڤ لەبەردەم ئەم چیرۆکانەدا سەرسام دەمێنێت و عەقڵ ولۆجیك تیادا بوونیان نامێنێت. ژیان لە میانەی ئەم بابەتانەدا مانای خۆی لە دەست ئەدات و ئەبێتە دارستانی چەقەڵ و درندەکان، تیادا هەموو شتێك ئەبێت بە ئارەزووو هەواو نەفس. لەم بابەتانەدا مرۆڤەکان لۆجیك لە دەست ئەدەن عەقڵ مالئاواییان لێ ئەکات .

## دەست درێژی سێکسی بۆ سەر کۆمەڵێك منداڵ لە مراکیش

دایك وباوکی سێ منداڵی مەغریبی سکاڵایان تۆمار کرد لە دادگای ئەو وڵاتدا لە سەر کۆمەڵێك گەشتیاری بیانی بە ئامادەبوونی پارێزەری کۆمەڵەی نەخیل بۆ پارێزگاریکردن لە مافەکانی ژنان و منداڵان لە شاری مەغریب بەهۆی دەست درێژیکردنی سێکسی بۆ سەر ئەم سێ منداڵە کە تەمەنیان لە نێوان حەوتساڵ ودە ساڵ و یانزە ساڵ بوون، بە پێی سەرچاوەیەکی ئەمنی لە پایتەختی گەشتیاری مەغریب وپاش خستنە رووی حاڵەتەکان لە بەردەم پزیشکی تایبەت دەرکەوت لە راپۆرتێکدا کە هەر سێ منداڵەکە تووشی دەست درێژی سێکسی بوونەتەوە، و هەروەها منداڵەکانیش دانیان بەوە دانا کە لە لایەن ئەو گەشتیارە بیانیانەوە دەست درێژیان لێ کراوە لە یەکێك لە ناوچە گەشتیارێکاندا کاری سێکسیان لەگەڵ کردوون.

# لە هەموو سەعاتێکدا ٧٨ حاڵەتی دەست درێژی سێکسی ڕوودەدات لە ئەمریکا

لە هەموو دەقیقەیەکدا لە ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ١،٣ حاڵەتی دەست درێژی سێکسی روو ئەدات و٧٨ ژن بە زۆر سێکسیان لەگەڵ ئەکرێت ئەویش لە سەعاتێکدا، بەلاّم لە رۆژێکدا ١٨٧١حاڵەتی دەست درێژی روو ئەدات واتە نزیکەی ٥٦٩١٦ حاڵەت لە مانگێکا بە پێی ئامارەکان لە٩٠٪ پلانی بۆ دادەرێژرێت پێش ئەنجامدانی بەلاّم لە ٨٧٪ حاڵە تدا دەردەکەوێت کە کەسی تاوانبار پەنا ئەباتە بەر بەکارهێنانی چەك و هەرەشەکردن و کوشتن ئەگەر لە کاتێکدا کەسی بەرامبەر بیبەوێت بەرگری بکات، هەروەها لە یەکێك لە زانکۆکانی ئەمریکا پاش ئەنجامدانی دیراسەیەك لە ساڵی ١٩٩٨راگەیانرا کە لە ٢٥٪ ی کچان دەست درێژی سێکسیان لەگەڵ ئەنجام ئەدرێت و لە ٥٠٪ی پیاوانی ناو زانکۆکانی ئەمەریکا دانیان بەو ناوە کە هەڵساون بە فشار خستنە سەر کۆمەڵێك ژن بۆ ئەنجامدانی کاری سێکسی، بەلاّم لە دیراسەیەکی تردا ئەوە ڕاگەیاندرا کە لە ٥١٪ ی پیاوان ئەگەر دڵنیا بوون لە ڕزگار بوون لە دەستی سزا ئەوا بێ رارایی هێرشی سێکسیان بۆ دەبەن،و لە هەندێك راپرسیدا ئەوە راگەیاندراوە کە لە ٧٥٪ لە پیاوان و لە ٥٥٪ لە ژنان پێش ڕوودانی دەست درێژی سێکسی مەی دەخۆنەوەو مادە هۆشبەرەکان بەکار ئەهێنن .

ویلایەتە یەکگرتووکانی ئەمریکا لە پێش هەموو ولاّتانی

جیهانداندایە بۆ زیاتر روودانی کاری سێکسی نا یاسایی، چونکە لە ساڵی ١٩٩٠ ڕێژەی دەست درێژێکان گەیشتۆتە١٠٠٠٠٠٠ حاڵەت ئەمەش بۆ یەکەم جار لە ولاتی ئەمریکادا، ڕێژەی دەست درێژی سێکسی زۆر روو لە زیادبوونە، بەڵکو ڕێژەکە چوار قات زیادی کردووە بەبەراورد لە چاو ساڵانی رابردوودا.

لە کۆتایی دیراسەیەکی مەیدانی ئەوەی راگەیاند کە ئەو کچانەی تەمەنیان لە نێوان ١٦ بۆ ٢٤ ساڵیدایە زیاتر روو بەرووی کاری لەم جۆرە دەبنەوە بەبەراورد لەگەڵ تەمەنەکانی تردا.

# کچێکی پاکستانی سکپڕ ئەبێ لە باوکی

کچێکی پاکستانی لە پارێزگای جدە لە عەرەبستانی سعوودی داوای لە لایەنی حکومی کرد باوکی دەست گیر بکەن، چونکە باوکی بۆ ماوەی سێ ساڵە کاری سێکسی لەگەڵ دەکاو لەگەڵیدا وەك ژنی خۆی جووت ئەبێ بێ ئەوەی بتوانێت لە دەستی خۆی ڕزگار بکات، یان یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەی یارمەتی بدەن بۆ ڕزگار بوونی لە دەستی ڕەشی چەپەڵی، هەروەها لە داواکەیدا داوای کرد لێکۆڵینەوەی لەگەڵ ئەنجام بدرێت بۆ دڵنیابوون لە قسەکانی. شایەنی باسە باوکی ئەم کچە لە دووکانێکی چاککردنی تەبرید کار ئەکات.

کچەکەی وتی: " چەند جارێك بیرم لەوە ئەکردەوە بچم بۆ دەزگای پۆلیس یان دادگا بۆ تۆمارکردنی کەیسەکەم بەڵام دەترسام بڕوام پێ نەکەن و باوکیشم لە بەرامبەردا ئازاری زیاترم بدات".

ڕۆژنامەی حەیاتی لەندەنی ئاماژەی بەوە کرد کە ئەم کچە چەند جارێك هەوڵی خۆکوشتنی داوە، بەڵام بۆی نەچۆتە سەر کچەکە ئەڵێت قەسەم بە خوا چەند جارێك ویستوومە خۆم بکوژم تا لە دەستی ئەم کابووسە ڕزگارم بێت کە هەموو شەوێك وەکو ئاژەڵێکی دڕندە هێرشم بۆ ئەبات بەڕاستی هیچ لێکدانەوەیەکم نەبوو بۆ ئەم کارە، چونکە دایکم دەیزانی بەڵام هەمیشە لەبەرامبەر ئەم کارەدا بێ دەنگ ئەبوو.

ئەم کچە پاکستانییە زیاتر لەسەر ئەم بابەتە قسەئەکات و ئەڵێت من کچێکی نەخوێندەوارم و حەوت براو چوار خوشکم هەیە، من لە

هەموویان گەورەترم دایکم چەند جارێك منی مووخەیەر کردووە لە هەڵهاتن یان قبووڵ کردنی واقیعەکە ئەو واقیعەی کە باوکی بەسەریدا سەپاندوویەتی.

لە چاوپێکەوتنەکەدا هەوڵی ئەدا فرمێسکەکانی قوت بدات، بەلاّم نەیدەتوانی تا فرمێسك بە چاوەکانیدا وەك ڕێژنەی باران هاتە خوار وتی: زۆر هەوڵم ئەدا کەسانی نزیك خۆم تێبگەیەنم، بەلاّم بڕوایان پێ نەئەکردم باوکم تەمەنی ٣٩ ساڵە ماوەی سێ ساڵە ئەم کارەم لەگەڵ ئەکات خوێن ڕێژێکی لە سکمدا بەجێ هێشتبوو، بەلاّم بەیارمەتی دایکم فڕێم دا لە پاش فڕێدانی حەبی بەربەستی سك پڕ بوونم دەخوارد کە خۆی بۆی دابین دەکردم.

بە پێی وتەی کچەکە باوکی لەگەڵ ئەوەشدا ئازارێکی زۆری ئەدا هەر بۆیە ئاسەواری لێدان و ئازاری پێوە دیارە، ڕۆژانە لە لایەن ئەم باوکە ئیهانە ئەکرا کام کارەی کە ناشێ لەگەڵ مرۆڤدا بکرێت ئەو دەیکات.

ئەو کەسەی ئەم کچەی لە نووسینگەی ڕۆژنامەکەدا ئامائەکرد لە جدە، ئەرك و بەرپرسیارێتی وەرگێڕانی کفتوگۆکەی گرتە ئەستۆی خۆی ئەڵێت: لە ڕێگەی یەکێك لە هاوسێکانیەوە کە ئەویش پاکستانییە کاتێك بەم کارەی زانیوە تووشی شۆك بووە، چونکە کچێك لەم تەمەنەدا دەست درێژی سێکسی دەرحەق ئەنجام بدرێ لە لایەن کەسێکەوە ئەویش کە باوکێتی. هەروەها ئەوەشی ڕوونکردەوە کە هەندێك لە هاوسێکانی بەوەیان دەزانی کە باوکی زۆر ئازاری ئەدات وحەبسی ئەکات، بەلاّم ئەوەیان نەدەزانی کە باوکی دەست درێژی کردۆتە سەر، چونکە بەڕاستی ئەمە ئابڕۆچوونە، بۆیە نەیتوانیوە

کەسانی تری لێ ئاگادار بکاتەوە، هەر بۆیە، من داواکارم لە بەرپرسان لێکۆڵینەوەیەکی جیدی لە کەیسی ئەم کچە بێ تاوانەدا بکرێت و سزای بدرێت لەسەر ئەم کارەی.

ئەمە لە لایەکەوە لەلایەکی ترەوە سەرۆکی کۆمەڵی مافی مرۆڤ لە مەکەی مووکەرەمە وتی: کچەکە مافی خۆیەتی داوای تەواوی رێوشوێنی پاراستن بکات لە کاتێکدا ئەگەر هاتوو ئەم راستییە ئسپات بوو. هەروەها ئاماژەی بەوەش کرد کە کۆمەڵکە رۆڵێکی گرنگی هەیە لە چارەسەرکردنی ئەم جۆرە کەیسانەو زۆر بەتوندی ئیدانی ئەم کارانە ئەکات.

سەرۆکی کۆمەڵکە وتی: دەتوانێت رووبکاتە کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە پارێزگاکەی خۆی و تەنسیقێك بکات لەگەڵ پسپۆرانی بەشی ژنان و سکالایەکی فەرمی پێشکەش بکات و تەواوی وردەکارییەکانی دەست درێژێکە بخاتە روو، لە پاشان بچێتە بەشی کاروباری کۆمەلایەتی بۆ دابین کردنی پاراستن.

سەرۆکی کۆمەڵکە درێژەی بە قسەکانی داو وتی: پاش دابین کردنی مافی پاراستن راگەیاندراوێك پێشکەش بە بەشی پۆلیس بکات و هەموو لایەنەکان تیادا ئامادە بن بەتایبەتی باوکی کچەکە تا ولامدانەوەی بۆ ئەم تۆمەتە تۆماربکرێت. پاشان لە وتەکەیدا وتی: رووداني ئەم جۆرە حاڵەتە لە عەرەبستانی سعوودی زۆر دەگمەنە، بەلام وا تێبینی ئەکرێت ئەم جۆرە حاڵەتانە روو لە زیاد بوونە بەتایبەتی پاش زیاد بوونی هاتنە ناوەوەی خەڵکی بیانی، ئاماژەی بەوەش کرد پێویستە دادوەر بەڵگەکان روون بکاتەوە بۆ بەهێزکردنی قسەکانی لەبەردەم دادگادا، بەتایبەتی ئامادەبوونی شاهیدەکان یان تەسبیت کردنی بابەتەکە لە

لایەن لژنەی پزیشکییەوە یان لیژنەی تایبەت بەم بوارانە.

هەروەها رایگەیاند کەیسی ئەم کچە دەست پێ ئەکات بە راگەیاندنێکی پۆلیس کە ئەوان مەلەفەکەی پێشکەش بە دادگاو دادوەری گشتی ئەکەن ئەوانیش رەوانەی دادگای خێرای ئەکەن بۆ یەکلاکردنەوەی بابەتەکەو سزا دانی تاوانباران.

# ژنێك لە ماڵی خۆیەوە دەکەوێتە ناو هۆڵی ماڵێکی ترەوە

روزالیا فالیا خمیتۆفا لە کاتێکدا لە ناو حەوزی حەمامەکەی پاڵی دابۆوە لە ناکاو سەقفی ژێر حەوزەکەی دەرووخێت و ئەویش بەحەوزەکەیەوە دەکەوێتە ماڵی هاوسێکەیەوە، کە ئەوان لە ژێرەوە بوون، سەبارەت بەم رووداوە روزالیا ئەڵێت: لە کاتێکدا من پاڵم دابۆوە لە ناو حەوزی حەمامەکەم کویێم لە دەنگێك بوو، بەڵام ئاگام لێ نەبوو چی روویدا ئەوەندەم زانی لە ناو هۆڵی دانیشتنی ماڵێکی تردام. ئامادەبوانی ناو ماڵەکە سەرسام بوون بەم رووداوە. شایەنی باسە ژنەکە هیچ شوێنێکی ئازارێکی ئەوتۆی پێ نەگەیشتبوو تەنها هەندێك رووشاندن لە قاچی روویدا بوو.

ئەندازیارانی ئەنجومەنی شارەوانی ناوخۆ ئاماژەیان بەوە کرد کە سەقفی ئەو شوقە کۆنانەی ناوچەی سۆلنتشنا لە سێرجێتی روسی زۆر کۆنن و بە دار دورروست کراون لەگەڵ تێپەربوونی کاتدا پزیون و خوراونەتەوە.

## وتیان پیاوی ئاسایشن کچێکیان فراندو لاقەیان کرد

لە سەر شێوەو ڕێگەی فیلمی میسری "ئەوباش" کە ئەکتەری میسری بەناوبانگ هالە فؤاد ڕۆڵی سەرەکی تیادا دەبینێ سێ گەنج کچێکی تەمن ١٦ساڵ دەرفێنن لە شاری جدە، دوایی ئەوەی خۆیان وەك پیاوانی ئاسایش پشاندا، کە گوایە باوکی کچەکە داواکراوە لەلایەن ئاسایشەوە. ئەم ڕووداوە ڕای گشتی تەواوی ئەو شارەی گرتەوە، سێ گەنج لە کات ژمێر دووانزەی نیوەڕۆدا هەڵیان کوتایە سەر ماڵێك بە پاساوی ئەوەی باوکی کچەکە داواکراوە لە لایەن ئاسایشەوە، داوایان لێکردن لەگەڵیاندا بێن. شایەنی باسە وەگێڕێکی زمانی عەرەبیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو.

پاش ئەوەی باوەڕیان بە باوکی کچەکە هێنا کە ئاسایشن، هەر سێ گەنجەکە، ڕاستەوخۆ بردیان و لە ژوورێکی چۆڵدا لە خۆرهەلاتی شاری جدە قاچ و دەستیان بەستەوەو دواتر هێرشی ئاژەلانەیان بۆ کچەکە برد لە پاش پاڕانەوەیەکی زۆر لە لایەن کچەکەوە، بەلام بێ سوود بوو.

باوکی کچەکە پاش چوار کاتژمێر توانی کۆت و بەندی دەستی بکاتەوە، بەخێرایی خۆی گەیاندە نزیکترین بنکەی ئاسایش ئاگاداری کردنەوە کە سێ گەنج کچەکەیان فراندووە، لە پاش هەوڵی پیاوانی ئاسایش توانرا یەکێك لە سێ گەنجەکە دەست گیربکرێ، کە پێی دەچوو لەوانی تر باشتربێ، دانی بە چۆنێتی تاوانەکە دانا. لە دوایی لێکۆلینەوەیەکی درێژ دەرکەوت کە ئەم سێ گەنجە سێ گەنجی

هەرزەكارن و لەم كارەیاندا ئۆتۆمبیلێكی لە جۆری مارسیدسیان بەكار هێناوە بۆ ئەنجامدانی ئەم تاوانە لە پاش ئەنجامدانی تاوانەكە بەجیٚ یان هێشتووە.

شایەنی باسە یەكێك لە گەنجەكان بە ڕەگەز ئەفریقییە.

تاوانەكە لە كاتژمێر دووی نیوەڕۆ روویدا بەلاٚم دەزگای ئاسایش كاتژمێر شەشی سەر لە ئێوارە هەواڵەكەی پیٚ گەیشت،و لە دوایدا توانییان پێش كاتژمێر چواری بەیانی هەموویان دەست گیربكەن، واتە پاش كەمتر لە هەشت كاتژمێر لە رووداوەكە.

پیاوانی ئاسایش هەوڵێكی زۆریان دا بۆ دەست گیركردنی تاوانباران و هەموو زانیارییەكیان سەبارەت بە گەنجەكان وەرگرت و نزیكەی ٤كیلۆمەتر بە پیٚ لە شوێنی رووداوەكەدا رۆیشتن، هەروەها نزیكەی ٢٧٠ شوێنی پشوو و پەراوێز كراویان بەسەر كردەوە، یەكێك لە زانیارییەكان ئەوە بوو كە گەنجێك لەوانە كوتانێك لە سەرشانی هەیە، كەبە پیتی ئینگلیزی نووسراوە، بە پییٚ ئەم زانیارییانە گەنجێكی تریان دەست گیركرد كە هەر لەگەڵ ئەواندا بوو پێشتر، بەلاٚم دانی بەوە دانا كە هیچ دەستێكی لەم رووداوەدا نییە.

لەم رووداوەدا كرێكارێك دەستی هەبوو لە پیشاندانی ڕێگا و دۆزینەوەی ئەو ژوورە چۆڵە بۆ حەبس كردنی باوكی كچەكە.

كچەكە پاش ئەوەی لەگەڵ یەكێك لە گەنجەكان بە دیل كراوی دەمێنێتەوە توانی هەڵبێت بۆ ماوەی چەند كیلۆمەترێك لەوان دوور كەوێتەوە.

## پاش ئەوەی ژیانی تێك دا وتی ناتوانم زەواجت لەگەڵ کەم

یەکێك لە رۆژنامە ناوخۆییەکانی کوێت بلاّوی کردەوە کە گەنجێکی سووری لە رێگەی ئینتەرنێتەوە کچێکی کوێتی ناسیوە لەگەڵ یەکدا خەریکی چات بوون بۆ ماوەیەکی درێژ، گەنجە سوورێکە بە کچەکەی راگەیاندووە کە ئەو لە خێزان وخانەوادەیەکی کوێتی ناودارە، لە پاشان کۆمەڵێك چاوپێکوتن لە نێوانیاندا رووئەدات، تا گەیشتە ئەو ئاستەی بابەتەکان پەرەیان سەند، تا وای لێهات مەوعیدیان بە یەکەوە دەبەست ئەویش لە ماڵەوە.

لە نێوان ئەم چاوپێکەوتنانەدا چەندین جار کاری سێکسیان بە یەکەوە ئەنجام ئەدا، کورەکە هەمیشە ئەوەی بۆ کچەکە دووپات ئەکردەوە زەواجت لەگەڵ ئەکەم یان مارەت ئەکەم خەمت نەبێ، بەلاّم هەموو ئەم قسانە دوور بوون لە ڕاستییەوە، دەرکەوت کوڕەکە درۆ لەگەڵ کچەکەدا ئەکات، لە پاش سێ ساڵ پەیوەندی سێکسی کچەکە ناچار بوو بەباوکی رابگەێنێ کە ئەو کورە نایەوێ بیخوازێت و هەموو قسەکانی تا ئێستا بە درۆ بووە، کاتێك باوکی کچەکە راستی ئەم کارەی بۆ دەردەکەوێت ڕاستەوخۆ دەزگای ئەمنی لێ ئاگەدار ئەکاتەوە، ئەوانیش ماڵی کوڕەکە دەدۆزنەوەو دەستگیری ئەکەن لە کۆمەڵێك لێکۆڵینەوەدا دان بەوە دادەنێ کە لە یەکێك لە شوێنی بلیاردەکاندا کار ئەکات لە ناوچەی فراونییە، لەهەمان کاتدا دانی بەوە دانا هەڵساوە بە گۆرینی کۆمەڵێك بەڵگەی کەسایەتی ئەوەشی راگەیاند ئەمە یەکەم جاری نییە بەڵکو چەند جارێك بەم جۆرە کچی هەڵخەڵەتاندووەو کاری سێکسی لەگەڵیان کردووەو وێنەی بە تەواوەتی گرتوون وەك بەڵگەیەك ئەگەر بێتو کچەکە وازی لێ بێنێت .

# دوو جار خیانەتی لیّ کرد جاریّك لە سەر جیّگا ئەوی تر لە سەر لاشەکەی

کاتیّك مرۆڤ ئەم چیرۆکە ئەخویّنیّتەوە مرۆڤ نابینیّ تیادا بەڵکو ئاژەڵ لە سەر شیّوەی مرۆڤ.

دووجار خیانەتی لیّ کرد جاریّکیان لە سەر جیّگای خەوتن کە لە پالّ میّردەکەیەوە کەسیّکی تری ئەهیّنایە سەرجیّگای میّردەکەی ئەو میّردەی بەدڵو بە گیان خۆشی دەویست، ئەوی تریان بۆ جیّبەجیّ کردنی بەشی دووەم لە شانۆگەریەکە دۆستەکەی بە کارهیّنا بۆ گوشتنی میّردەکەی، میّردەکەی لە ماڵەوە بوو پەرداغیّك شەربەتی ژەهراوی بۆ تیّکرد بیّ هۆشی کرد، لەپاشان بانگی دۆستەکەی کرد خستیانە ناو ئۆتۆمبیلیّکەوەو لە قەراغ پایتەختی میسر قاهیرە فریانداو دۆستەکەی لە بەر چاوی بە چەقۆ لەشی هەموو وەکو پەڕۆیەکی دڕاو لیّ کرد، لە پاشان لەسەر لاشەی میّردەکەی دەستی خستە ناو دەستی دۆستەکەیەوەو ئەوەی خودا پیّیّ ناخۆشە کردیان.

بۆ ماوەی سیّ ساڵە سەعید زەواجی لەگەڵ یەکیّك لە هاوسیّکانی کرد ئەویش کە ناوی نەجات بوو، پاش

چیرۆکیّکی خۆشەویستی دریّژ کە لە نیّوان نەجاتو سەعیدا روویدا، زۆر بە بەختەوەری ژیانیان بەسەر ئەبرد ئەم ژیانە پڕ لە بەختیارییە هیچی کەم نەبوو تەنها ئەوە نەبیّ منداڵیان نابوو، هەر بۆیە سەعید سەرچاوەی بیّتاقەتی ئەوە بوو کە ئەو هۆکارە بۆ نەبوونی منداڵ، بۆیە

لەبەر ئەمە سەعید زۆر بایەخی بە نەجات ئەدا، هەندێك كات زیادەرەوی ئەكرد لە بایەخدان و ئەیەویست ئەوەی بۆ قەرەبوو بكاتەوە كە دایك نییە، نەجات گوێی نەدایە ئەوەی كە بۆتە قوربانی لە پێناوبەردەوام بوونی ژیانی هاوسەرییان، رووناكی ماڵی هاوسەرییان هەمیشە گەشاوە بوو، سەعید هەمیشە هەوڵی ئەدا بۆ ئەوەی دڵ خۆشی بكات.

سەعید لە یەكێك لە كارگەكانەی دووروستكردنی جل وبەرگ كاری ئەكرد، لەگەڵ ئەوەشدا ئۆتۆمبیلێكی تاكسی كڕی بوو بۆ ئەوەی زیاتر كار بكات، تابتوانێت زاڵ بێ بەسەر سەختی ژیاندا، تا وای لێهات تەواوی رۆژی خۆی لە نێوان كارگەو شۆفێریدا ئەبردە سەر، لە بەرامبەردا لە جیاتی ئەوەی ژنەكەی دەست خۆشی لێ بكاتو كەمێك لە ئازارەكانی كەم بكاتەوە كە چی بە پێچەوانەوە بێتاقەتی زیاتر ئەبەخشی بە مێردەكەی، بەم شێوەیە هەموو رووناكییەك لەو ماڵەدا كوژایەوە، مامەڵەی نەجات تەواو بێ بایەخ بوو، لەم نێوانەدا كەسێك دەركەوت ئەویش سەفوەت بوو، هاوسێیان بوو، لە یەكێك لە دەوڵەتە عەرەبێكان كاری ئەكرد پاش ئەوەی گرێبەستەكەی تەواو بوو هاتەوە.

سەفوەت لە بینایەیەكی بەرامبەر ماڵی سەعید بوو هەموو رۆژێك لە باڵكۆنەكە دەهاتە دەرەوەو بەتوندی تەماشای یەكترییان ئەكرد هەتا هێواش هێواش پێكەنین لە نێوانیاندا دەستی پێ كرد، نەجات بێ هیچ بەرگرییەك خۆی دەایە دەستەوە سەفوەتیش هەموو رۆژێك دەچووە ماڵیان سەردانی ئەكرد، نەجات پێشنیارێكی كرد، ئەوەیش ئەوە بوو خۆی بكاتە برادەردی مێردەكەیو رۆژانە بێت سەردانی ماڵیان بكات، نەجات هەموو رۆژێ پێش ئەوەی مێردەكەی بێتەوە خواردنی پر لە ژەهری بۆ ئامادە ئەكرد بۆ ئەوەی هەموو شتێك ئامادە بێ بۆهەموو ئەو

شتانەی کە خوا پێی ناخۆشە.

سەعید ڕۆژ لە دوای ڕۆژ گومانی بۆ دووروست ئەبوو لەوەی سەفوەتی هاوسێیان زۆر رووی ئەکردە ماڵیان نەجاتی خێزانی زۆر بە گەرمی پێشوازی لێ ئەکردو بایەخی پێ ئەدا، ئەم هەموو گومانانە بوو بە واقیعو بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگر، بەتایبەتی کاتێك هەندێك لە هاوسێکانی باسیان لە پەیوەندی نەجاتو سەفوەت ئەکرد، کاتێك سەعید روو بە رووی نەجات بووەوە ئەم راستییانەی پێ ڕاگەیاند نەجات وەك ئاگر پلیسەی دا بە رویداو هەڕەشەی ئەوەی لە سەعید کرد کە ماڵەوە بە جێ ئەهێڵێت سەعید وتی: پەلە مەکە تۆ ناچیتە دەرەوە هەتا وەرەقەی تەلاقەکەشت لەگەڵ خۆت نەبەیو ئەبێت

ئابرووشت لە بەر چاوی خەڵکی بەرم ئینجا بڕۆ.

کاتێك نەجات هەستی بەوە کرد کە مێردەکەی بە تەمای تەلاق دانێتی ڕاستەوخۆ چووە لای سەفوەتو هەموو شتێکی تێگەیاند وتی: پێش ئەوەی سەعید کارێکی لەم جۆرە بکاتو حەیامان بەرێت ئەبێت تۆ شتێك بکەیت؟ سەفوەت هەمیشە بیری لەوە ئەکردەوە جۆن پلانێك دابڕێژی بۆ لە ناوبردنی سەعید. نەجاتو سەفوەت شەوێکیان دانا بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم کارە.

لە یەکێك لەو شەوانەی کە لە سەری ڕێککەوتبوون، هەر وەکو شەوانی تر سەفوەت دابەزییە خوارەوەو چووە قاوەخانەکەی نزیك ماڵیان بەئەنقەس ویستی ئەم شەو خەڵکی گەڕەك ببینن، لە پاشان چوەوە شوقەکەی خۆی، هەروەها پێی وتن کە دەخەوێت هەتا بەیانی. لە کاتێکدا جمووجۆڵی خەڵکی نەما ئەو گەڕەکە هەمووی بێ دەنگ بوو سەفوەت ڕاستوخۆ رووی کردە ماڵی نەجات لەوێ ئەو هەموو شتێکی

ئامادە کردبوو، مێردەکەی دەرمانخوارد کردبوو سەفوەتیش فڕێیدایە ناو ئۆتۆمبیلەکەی‌و لەشوێنێکی چۆڵدا لە قاهیرە کەوتە گیانی بە چەقۆو هاتەوە بۆ لای دۆستەکەی لە سەر هەمان جێگای مێردەکەی کاری فاحیشەیان کرد.

سەر لەبەیانی خێرا نەجات خۆی گەیاندە پۆلیس‌و ئاگاداری کردنەوە کە مێردەکەی ئێوارە لەگەڵ مەغریبدا بۆ کاری تاکسی کردن چۆتە دەرەوە، بەڵام نەهاتۆتەوە ئەوانیش نوسراوی خۆیان نووسییەوە سەبارەت بەم رووداوە، پیاوانی ئاسایش تەرمی مێردی نەجاتیان دۆزییەوە بە کوژراوی، لە کاتێکدا بۆنی کردبوو، بەڵام توانرا پەنجە دەستی وەربگرن‌و بەراوردی بکەن لەگەڵ نموونەکاندا کە چی دەرکەوت پەنجەی دەستی ژنەکەی لەگەڵ پەنجە وەرگراوەکاندا یەکن، کاتێک نەجاتیان بردە سەر تەرمەکەی بۆ ناسینەوەی کە بینی خۆیەتی دەستی کردە نواندن لە خۆدان‌و گریان، بەڵام پاش چی لە دوای تەواو بوونی هەموو شتێك.

پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر دەکەوت کە سەفوەت‌و نەجات هەردووکیان سەعیدیان کوشتووە، هەر چەندە کاتێك نەجات روو بەرووی سەفوەت بووەوە لە ناو دادگا نەجات دانی بەوەنا کە سەفوەت سەعیدی کوشتووە، بەڵام سەفوەت پر بە دەمی هاوری کرد کەر. . . کەر . . . پاش ماوەیەك هەموویان بە تەواوی دانیان بە هەموو تاوانەکانیان نا لە بەردەم بەڕێوەبەری ئیدارەی گشتی لێکۆڵینەوە ڕاستەوخۆ هەر دووکیان ڕەوانەی گرتووخانە کران‌و ئیتر پەشیمانی داد نادات تەواو.

# لاقەکردنی کچێك لە پارچە ڤیدیۆیەکدا

رۆژنامەیەکی سعوودی بلاۆی کردەوە کە بەم دوایە پارچە ڤیدیۆیەك بلاۆ بۆتەوە کە وێنەی کچێك وکورێکی تیادایە کە کاری سێکسی ئەکەن ئەم پارچە ڤیدیۆیە زۆر بە شێوەیەکی خێرا لە رێگەی بلووتووسەوە بلاۆ بۆتەوە، شایەنی باسە وەزارەتی ناخۆ لە لێکۆڵینەوەدایە سەبارەت بەم پارچە ڤیدیۆیە، هەروەها رۆژنامەی عەرەب نویز کە بەزمانی ئینگلیزی بلاۆئەکرێتەوە روونی کردەوە کە پارچە ڤیدیۆکە لە خولەکێك کەمترە، تیادا گەنجێك دەست درێژی سێکسی ئەکاتە سەر کچێكو پێی ئەڵێت "درۆت کرد" وتت رۆژی هەینی ئەرۆم سەردانیماڵەوە ئەکەم.

هەروەها رۆژنامەکە لە سەر زاری وتە بێژی وەزارەتی ناخۆی سعوودیە وتی: کە پارچە ڤیدیۆکە ئەوە روون ئەکاتەوە کە ئەگەری روودانی تاوانێك ئەکرێت لەوەی کوڕەکە هەرەشە لە کچەکە ئەکات، پێویستە لە رێگەی ئەم پارچە ڤیدیۆیەوە ناسنامەی تاوانبار بدۆزرێتەوەو دەستگیر بکرێتو رەوانەی دادگا بکرێت، ئەم هەواڵە بووە هۆی تووڕەیی لە نێو هاولاتیانی سعودیەدا کە ئافرەتێك بەم شێوەیە دەست درێژی سێکسی بکرێتە سەر.

ژنێك بە رۆژنامە سعوودیکە ئەڵێت ئەمە ژیانی ئافرەتێکە روو بە رووی مەترسی ئەبێتەوە، نازانم چۆن دەژی یان ژیان ئەباتە سەر کاتێك

خەڵکی دەیناسنەوە، داوا ئەکەم تاوانبار دەست گیر بکرێت و ڕەوانەی دادگا بکرێت.

سەبارەت بەم ڕووداوە ئەمیری ریاز لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٤ فرمانی دا بە دەستگیر کردنی تاوانبارو هەروەها ئەوکەسانەی کە وێنەکەیان گرتووە هەروەها دادگای توندیان دەرحەق بکرێت.

## خوێندکارێکی دۆڕاو بە دزیو ساختە دەست ئەگرێ بەسەر پێنج ملیۆن جنێهی میسریدا

لە نێوان قاهیرەو ئیتاڵیادا گەورە بوو، لە جیهانی کوشتنو برینو دزینو فێڵ وساختەدا دەژیا، سەرەڕای ئەوەی تەمەنی لە ٢٤ساڵ زیاتر نەدەبوو، بەڵام توانی لە هەموو بەڕێوەبەرایەتییەکانی میسردا فایلێك بە جێ بێڵێت بە کارە سەختەکانی. پۆلیس شەش ساڵ بە دوایدا دەگەڕا هەموو هەوڵێکی خۆی خستە گەڕو هەموو جۆرە پلانێکیان بە کار هێنا، بەڵام بێ سوود بوو، لە پاش زنجیرەیەك تاوانکاری هەر لە دزی ئۆتۆمبلو پارەو کارتی تایبەت بە پیاوانی ئاسایشو دادوەرو پزیشك توانرا دەست گیر بکرێت.

قەبارەی تاوانەکانی یەجگار زۆر بوو، تا گەیشتە ئەو ئاستەی لە ڕێگەی دزییەوە دەستی گرت بەسەر پێنج ملیۆن جنێهی میسریدا، بەم پارەیە بە هەموو شێوەیەك رایدەبوارد لە ئوتێلە پێنج ئەستێرەکانو رابواردن لە دەم ئاوەکانو وەك پیاوێکی دەوڵەمەند ژیانی بەسەر ئەبرد، گەشتی ئەکرد بۆ وڵاتان چۆنی بویستایە رایدەبوارد، بەڵام دەزگا لێکۆڵینەوەکانی قاهیرە دەست گیریان کرد ئەویش لە ژوورێکی پەراوێزکراودا لە شاری سەلام لە قاهیرە.

تاوانبار دانی بە هەموو تاوانەکانیدانا، ئەوەشی راگەیاند کە خوێندکاری کۆلێژی ئەندازیارییە. ئەم تاوانبارە پسپۆر بوو لە چۆنێتی دزی کردن و هەڵخەڵەتاندن، ئەویش لە ڕێگەی مادە هۆشبەرەکانەوە

بوو کە لە ئیتالیاوە دەیهێناو کاری پێوە ئەکرد، بۆ ماوەی سێ ساڵ. کاتی خۆی کە دەچێتە رۆما لەوێ لەلایەن هەندێك کەسەوە تووشی بێ هۆشی ئەکەن، هەرچی پارەو موڵکی هەیە هەمووی لێ دەفرێنن، ئەو لەو کاتەوە ئەوەی لە مێشکدا دروست بوو کە بەهەمان شێوە تۆڵەی خۆی لە خەڵکی بکاتەوە.

تاوانبار بۆ چەند جارێك لە زیندان خۆی قوتار کردووە، وەك گرتووخانە (المنصورە)و بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی (الجیزە) بەم شێوەیە هەمیشە هەوڵی ئەدا خۆی ڕزگار بکات، بەڵام بێ سوودە، لە بەر زۆری تاوانەکانی لە لایەن شەش بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشەوە داواکراو بووە، بە تۆمەتی مامەڵە کردن بە مادە هۆشبەرەکانەوە، شایەنی باسە لە یەکەم تاوانیدا کە ئەنجامی دا مادەی هۆشبەری بەکارهێنا کە کاتێك لە فرۆکەخانەی وڵات دابەزی لە ئۆتومبیلێکدا سەر کەوت لەگەڵ حەوت نەفەری تر، هەر لە ناو ئۆتومبیلەکەدا لەگەڵ نەفەرەکان هەڵسا بە تاقیکردنەوەی مادەکانی ئەوە بوو هەموویانی بێ هۆش کردو لە بیابانێکی چۆڵدا بە جێ یانی هێشتو هەر چی پارەو پووڵ هەبوو بردی لەگەڵ خۆی .

بەم شێوەیە رۆژ لە دوای رۆژ تاوانەکانی فراوانتر دەبوو، هەنگاوی دەنا بۆ پارێزگاکانی میسر لەوێ خەڵکانی لە خشتە ئەبردو تاوانەکانی روو لە زیادبووندا بوو، تا گەیشتە ئەو ئاستەی خۆی کردە ئەفسەری پۆلیسو ناسنامەکەی ئەوی ساختە کردو وێنەی خۆی لێ دا لەگەڵ دوو ئەفسەری تردا توانییان پیاوێك دەستگیر بکەنو هەشت هەزار جنێهی پێ بنووسن لە سەر چەکی بانقەکەیو هەروەها داوای ١٤هەزار جنێهی تری لێ کرد لە بەرامبەر ئازادکردنیدا.

یەکێك لە تاوانەکانی تر رۆژێك لە وێستگەی بەنزینخانەیەك لە ناوچەی (شبرا الخیمە) دا دەستی گرت بە سەر ئۆتومبیلی کەسێدا کە لەوێ بەنزینی پر ئەکرد، توانی باوەڕ بە کارمەندەکانی وێستگەکە بێنێ کە هی خۆیەتی و ئەو دزەو دەیەوێت ستەمی لێ بکات ئەوانیش باوەڕیان پێ کردو داوای لێ کردن کابرا بەر نەدەن تا ئەچێت پۆلیس ئاگادار ئەکاتەوە. یەکێك لە تاوانەکانی تری شەوێك لەگەڵ یەکێك لە بەڕێوەبەری ئوتێلێك لە شاری (رأس سدر) دا ئەو شەوەیان بە رابواردن بەسەر ئەکردەوە، توانی خۆی و خێزانەکەی بێ هۆش بکات دەستبگرێتە سەر کلیلی قاسەکەیان و ٧هەزار جنێە دەربێنێ و ئۆتومبێلی یەکێك لە ئامادە بووانیشی فراند لە دوایدا فرۆشتی بە ٧ هەزار جنێهی تر. تاوانەکانی یەك لە دوای یەك زیاتر دەبوو کۆتا تاوانی ئەوە بوو وایەرمەنێکی بێهۆش کردو ٢٨ هەزار جنێهی لێ دزی دوای ئەوەی گفتی پێدابوو ئۆتومبیلەکەی پێ بفرۆشێت کە لە جۆری مارسیدس بوو، بەلأم ئەویشی فریودا، ئەم وایەرمانە هەڵسا بە خێرایی پۆلیسی لێ ئاگادار کردەوە، دەکەوت ئەو هەمان ئەو کەسەیە کە پێشتر کەسێکی تری بەم جۆرە فێڵە فریوداوە، ئەویش پاش ئەوەی بێ هۆشی کرد بوو. لێکۆڵینەوەکان ئەوەیان دەرخست کە ئەم تاوانبارە لە یەکێك لە ژوورە پەراوێز کراوەکاندا دەژی لە ناوچەی (کفر ابو حیر) لە شاری سەلام، کاتێك لەو شوێنەی دەستیان بەسەردا گرت ٢٥هەزار جنێهی لا بوو، هەروەها کۆمەڵێك زێرو زیوو وئۆتومبیلی دزراوو ژمارەیەك کارتی تایبەتی خێزانی، وهەروەها چەند ژمارەیەك لە مۆڵەتی لێخوورینی ئۆتومبیل بە چەند شێوەیەکی جیاواز کە بێ گومان هی کۆمەڵێك کەسی بێ تاوان بوون کە بەدەستی ڕەشی ببوونە قوربانی.

## لە میانەی دادگایی کردنیدا، داوای لە خۆشەویستە بکوژەکەی کرد، ببێت بە هاوسەری؟!

چی دەکەی ئەگەر هاتوو لە شەوێکدا ئەوکەسەی کە کردووتە بە خۆشەویستی خۆت و عاشقی بوویت، پێت بڵێت کە بکوژەو دەستی سوور بووە بە خوێنی کچێك کە پێشتر پەیوەندی پێوە هەبووە، کەچی هەڵساوە بە پارچە پارچە کردنی لەشی پاشان لە ناو زبڵدانێکدا فرێداوە. بێگومان ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە پۆلیسەوە ئەکەی، یان پەیوەندیت لەگەڵی دەپچڕی، یان لە بەر چاوی دوور دەکەویتەوە لە ترسی ئەوەی نەکا تۆ نیشانی دووەمی بیت وانییە؟ بەلاّم لەم ڕووداوەدا پە پێچەوانەوەی هاوڕێی ئەو سیستەرە بکوژە کە دەیزانی هاوڕێکەی بکوژە، بەلاّم لە بەرامبەردا هیچی نەکرد، بەڵکو لە هەمووی سەیرتر لە کاتی دادگایی کردنەکەیدا لەناو دادگاو لە بەر چاوی ئامادە بوواندا دەستی بۆ درێژ کردو داوای زەواجی لێ کرد، کە پێش چەند کات ژمێرێك دانی بە کوشتنی خۆشەویسترین کەسی نا، ئەم کچە بکوژە ڕازی بوو بە هاوسەرگیری لەگەڵیدا بەوەی کە ئاواتەکەی هێنایەدیو ئەو کەسەی ویستی بوو بە موڵکی، لە پاشان خۆی تەسلیمی پۆلیس کردو هەموو ئامادەبووان سەریان سوورما بەم کارەی ئەم کچە. بەتایبەتی کاتێك کوڕەکە وتی: ئەو خۆشەویستی خۆی بۆ هێناوم لە پێناویشیدا خۆشەویسترین ڕەفیقی کوشتووە، وداوا کردنی زەواجی من لەو جۆرێك بوو لە خەلاّت کردنی ئەو لە بەرامبەر

خۆشەویستیەکەیدا.

کچە بکوژەکەی خۆشەویستی تەواو بەم قسانە دڵ خۆش بوو وتی: من ئەمەوێت زەواجی لەگەڵ بکەم و بەبەختەوەری لەگەڵیدا بژیم، لە هەمان کاتدا هاورێکەم لە یادناکەم کە بووە قوربانی. ئەمە رێگەو شێوازی منە بۆ پێشاندانی پەشیمانی لەسەر ئەوەی کە کردی، لەبەرامبەردا پێیان وترا چۆن دەتوانن بە بەختەوەری بژین، بکوژ نابێ چێژ لە ژیانی وەربگرێت. لەهەمان کاتدا پسپۆرێکی یاسایی وتی: تاوانبار ئەکرێت بخرێتە زیندانەوە بۆ دە ساڵ.

# کچێکی هەرزەکار هاوسێیەکی خۆی دەکوژێ لەبەر ئەوەی پێی وتووە خزمەتکار

هەر وەك چۆن پیاو غیرە ئەکات بەهەمان شێوە یا خراپتر کچان یان ژنان غیرە ئەکەن، نەك لە ڕەگەزی بەرامبەر تەنها بەڵکو لە نێوان یەکتریشدا.

کچێکی هەرزەکار دوای کۆچکردنی باوکی، دایکی بەرپرسیارێتی بەخێوکردنی گرتە ئەستۆی خۆی، بەلاّم نەیتوانی زاڵ بێ بەسەر ناخۆشییەکانی ژیاندا بەتایبەتی پاش ئەوەی براکەی بە تۆمەتی مامەڵەکردن بە مادە هۆشبەرەکانەوە داخڵی زیندان کرا، هەروەها خوشکە گەورەکەشی شووی کردو چووە ماڵی خۆی.

ئەم کچە هەرزەکارە زۆر هەستی بە بێ کەسی ئەکرد، لە گەڕەکێکی هەژار نشیندا دەژیا، خەڵکی ئەو گەڕەکە هەموو هەناسەیەکیان لەسەر ئەژمارد خەڵکێکی نەخوێندەوار هەمیشە هۆکاری ئەوەیان لێ دەپرسی بۆ براکەت لە زیندانە؟ ئەویش لەبەرامبەردا هەستی بەخەجاڵەتی ئەکرد نەیدەزانی چۆن وەلاّمیان بداتەوە.

هێشتا منداڵە ژیانێکی درێژی لەبەردەم ماوە، سەختی ژیان وای لێکرد هەوڵ بدا خۆی پارە پەیدا بکات کارێك بکات بۆ خۆی، چونکە ئیدی کەس نەما نانی بدات، هەر بۆیە هەڵسا لە گەڕەکێکی دەوڵەمەندو ئەندازیار نیشیندا بوو بە خزمەتکار کە لە گەڕەکەکەی خۆیەوە زۆر دوور نەبوو، چونکە ئەوان لە "بوولاّق" نیشتەجێبوون تەنها هێڵی شەمەندەفەرێك لەگەڵ ئەو گەڕەکەدا جیایانی ئەکردەوە، کە کاتێك چووە ماڵێکی دەوڵەمەند خزمەتکاری ئەکرد بینی لەوێ هەموو شتێك جیاوازە کچانی ئەوێ هەموو شتێکیان لە بەردەستدایە، خزمەتدەکرێن

نازدارن لە ژیانێکی خۆشدا دەژین بە حووکمی ئەوەی ماڵەکان لە یەکترەوە نزیکە هەمیشە کچانی ئەوانی دەبینی لەو خۆشییەدا بوون، هەستێکی لە لا دروست بوو کە بۆ ئەبێ ئەوان وا بژین ئەمیش هەمیشە لە خزمەتکاریدا بێت؟ ئەم قسانەو دەیانی تر بەناو هۆشیدا دەهات دەرۆیشت هاوسێیەکیان هەبوو لە گەڕەکی دەوڵەمەند نشینەکەدا، هەمیشە ئەوەی ئەدایە چاوی کە ئەو ناتوانێت وەك کچەکانی خۆی بژێت، چونکە نەخوێندەوارەو لە هەمان کاتیشدا خزمەتکارە.

لەیادمان نەچێت کچەکە تەمنی هەژدە ساڵە، قسەکانی ئەو ژنەی هەمیشە لە ناو بیریدا دەگوتەوە بۆ ئەبێت من وابم؟؟ زۆر خەفەتی ئەخوارد، چونکە کچەکانی ئەو لەنازو نیعمەتدا دەژین منیش خزمەتکاری نێومالآن، ئەو ژنەی هاوسێیانیش بەبەردەوام روو بەرووی ئەبۆوە، ئەم هەستە لە ناو دڵیدا بوو بە ڕق وکین و رۆژ لە دوای رۆژ پەرەی دەسەند تا رۆژێکیان لەگەڵ یەکێك لە کچەکانی ناوی مەروە بوو بە دەمەقاڵێیان ناخۆشی کەوتە نێوانیان، خەڵکی گەڕەك هەموو کۆبوونەوە هەمووان حەزیان ئەکرد هێوریان بکەنەوە، پاش هەوڵێکی زۆر بێ دەنگ بوون، خەڵکی وایانزانی ئیدی تەواو ئەم کچە بکوژە بەوە رانەوەستا، چووە ماڵەوە لە ناو چێشتخانەکەیان چەقۆیەکی هێنا دوو سێ جار لەسەر دڵی ئەو ژنەی دا کە ماوەیەکی زۆر بوو پێی دەوت تۆ خزمەتکاری ناتوانێت وەك کچەکانی من ببیتە ژن ومالّو ماڵداری بکەی ژنەکە تەمەنی پەنجا ساڵ بوو.

بەم شێوەیە ئەم کچە هەرزەکارە ماڵی و ئایندەی خۆی بەرەو ئاراستەیەکی خراپتر برد بەشێك لە تەمەنی ئەبێت لە ناو کوچی زیندانا بەرێتە سەر.

## شەقاوەکانی تاوانی پلان دارێژراوی ئیسرائیلی مێردێك لە بەر چاوی ژنەکەی دەکوژن

کوشتن‌و برین‌و تۆڵە سەندنەوە، لە نێوان ئەندامەکانی شەقاوەکانی تاوانی پلان دارێژراوی ئیسرائیلی بەردەوامەو کۆتایی پێ نایەت، بەم دواییە حەنانییا کە تەمەنی ٤٢ساڵ بوو کەوتە بەر هێرشیان ئەویش لە ناو گەراجێکدا خەڵتانی خوێنیان کرد، ژنەکەی بەم شێوەیە وردەکاری رووداوەکە ئەگێڕێتەوە:

مـن‌و مێردەکـەم لـە شـوقەکەماندا هاتینـە خـوارەوەو روومـان کـردە گـەراج، کـە چـی لـە ناکـاو دوو پیـاو لـە ئۆتومبلێکـدا هاتنـە خـوارەوەو یـەکێکیان بـەرەو مـن هـات پـاڵێکی پێـوە نـام، بـەڵام ئـەوی تـر بـێ هـیچ گفتوگۆیەك چەند گولەیەکی نا بەچەستەی مێردەکەمەوە.

شێرلی خێزانـی حـەنانیا تەمـەنی ٢٥ سـاڵە دەڵێت: چووم مێردەکەم هەڵبگرمەوە کە چی ئۆتومبیلەکەیان ئاگر بەرداو هەموو ناو گەراجەکە بـوو بـە دووکـەڵ خـەریك بـوو ئـەخنکام چوومە دەرەوەو ڕامکرد. چەند ئەفـسەرێکی پـۆلیس ئـەوەیان ڕاگەیانـد کـە ئـەم تاوەانـە زۆر بـە باشـی پلانی بۆ دارێژراوە بەم دواییە تاوانی لەم جۆرە زۆر روو ئەدات.

بە پێی ئەو زانیارییانەی کە دەزگای پۆلیس پێی گەیشتووە ئەڵێت حـەنانیا ئەنـدامێکی چـالاك بـووە لـە شـەقاوەکانی پلانـی دارێـژراوی ئیسرائیلی بەم دواییە هەوڵی ئەدا ناشتبوونەوە بکات لە نێوان خێزانی ئیبریجـلۆ فـەرون وزەئیـف‌و روزنـشتاین‌و خێزانـی بـاوکی تـەبلێ بـۆ

کۆتاییی هێنان بە پاککردنەوەی جەستەیی لە نێوانیاندا.

ئەندامێکی تاوانکار لە پلانی داڕێژراوی ئیسرائیلی ئەڵێت: پێی ئەچێت حەنانیا نەیتوانی بێت نێوانیان یەکبخاتەوە بۆیە ناچار بووە لایەنگری لایەنێك بێت، بۆیە لە ناویان برد هەروەها راشیگەیاند کە هەر دوو بکوژەکە نزیك کات ژمێر دەی سەر لەبەیانی بە ئۆتومبیلێکی دزراو ئەم کارەیان ئەنجام داوە، هەر بۆیە سەیارەکەیان ئاگر تێبەرداوە، بۆ ئەوەی پاشماوە تاوانەکە هیچ نەمێنێتەوە.

# پۆلیس لە شاری "سۆڵت لێك" کچێکیان بینی لەگەڵ رفێنەرەکانی پیاسەی ئەکرد

ئیلیزابێس ئەو کچەکە ئەمریکییەیە کە هێشتا تەمەنی پانزەساڵەی تێنەپەڕاندووە، ئیلیزابێس لە کاتێکدا لە ژووری خەوتنەکەیەدا سەرقاڵی ئەوە بوو بخەوێت لەناکاو پیاوێك خۆی کردە ژوورەوەو هەڕەشەی لێ کرد نابێ بە هیچ شێوەیەك دەنگ دەربکات ئەگینا دەیکوژێت، ئیلیزابێس زۆر دەترسا لەو کاتەدا خوشکە بچووکەکەی گوێی لەم قسانە ڕاگرتبوو بەلاّم وا خۆی پیشان ئەدا کە خەوی لێکەوتووە، ئەویش نەیتوانی هیچ شتێك یان دەنگێك دەربکات، دوای ئەوەی پیاوەکە بە بێ دەنگی ئیلیزابیسی فراند، پاش دووکات ژمێر خوشکەکەی بە ماڵەوەی ڕاگەیاند کە شتێك لەم جۆرە ڕوویداوە، لێرەوە گەڕان بە دوایدا دەستی پێ کرد پاش ماوەیەك لە گەڕان پۆلیس توانی کەسێکی گومان لێکراو دەست گیر بکات، بەلاّم دواتر خوشکە بچووکەکەی ئەو گومانەی ڕەت کردەوەو وتی: دەنگی فرێنەرەکە بە دەنگی یەکێك لەو کرێکارانەی ئەکرد کە لە ماڵیاندا کاریان ئەکرد، گەڕان بەردەوام بوو بەدوایدا، پاش ماوەیەك لە گەڕان و لێکۆڵینەوە پۆلیس بینییان ئیلیزابێس لەگەڵ فرێنەرەکانی هەر یەك لە براین، میشڵ قژ درێژێکی ڕیش دار هەروەها خێزانەکەی واند برێز کە پێشووتر بە تۆمەتی فراند لە لایەن دەزگای ئاسایشەوە دەستگیر کرابوون لەگەڵیاندا پیاسەی ئەکرد ٢٠ میل لە دوور ماڵیان.

ئەوەی سەیر بوو ئیلیزابێس هەرگیز بەوەی نەئەکرد فرێنرا بێ زۆر بە شێوەیەکی ئاسایی لەگەڵیاندا پیاسەی ئەکرد ئەم کردارەی و هەوڵنەدانی بۆ ڕزگار بوون لە دەستیان کۆمەڵێك گومانی دروست کرد، بەلاّم بە پێی لێکۆڵینەوەی ئاسایش ئەوە دەرکەوت کە ئەوان بە هیچ شێوەیەك چاویان لێ ون نەبووە بۆیە نەیتوانیوە خۆی لە دەستیان رزگار بکات.

ماڵەوە هەمیشە دڵیان خەبەری ئەوەی ئەدا کە لە ژیاندا ماوەو نەمردووە، بەلاّم کاتێك پۆلیس هەواڵی دۆزینەوەی پێ ڕاگیاندن خێزانەکەی دایك وباوکی وتیان ئێمە پێشبینی ئەوامان ئەکرد تووشی لێدان و ئازارو ئەشکەنجە بووبێتەوە، بەلاّم پسپۆران ئەوەیان ڕاگەیاند کە بە شێوەیەکی باش مامەڵەی لەگەڵ کراوە روو بەرووی شووشتنی مێشك بۆتەوە بۆ قبووڵکردنی ئەو ڕەوشەی تیادا دەژی.

بە تێپەڕبوونی کات وایان لێ کردبوو ببێت بەیەکێك لە وان تازە بواری ڕاکردنی نەماوەو ئەبێت لە لایان بمێنێتەوە، بێگومان لەبەر ئەوەی کچێکی هەرزەکارە بوو بە قسەکانیان قەناعەتی کردبوو .

دابرانی خێزان بەرش و بلاّوبوونی ئەندامەکانی هۆکارێکی پاڵنەرە بۆ ئەنجامدانی کارێك لەم جۆرە، شایەنی باسە براین پێشووتر ژنەکەی تەلاّق داوە ئەو ژنەی کە سێ منداڵی لێ هەبوو، هاوسەرە تازەکەشی هەمان چیرۆکی بەسەر هاتووە، ئەم هۆکارانە وایلێکردوون ئیلیزابێس بفرێنن.

## ژنێکی وچاغ کوێر تۆڵەی خۆی لە ژنی دووەم ئەکاتەوە

تەمەنم ١٥ساڵ بوو شووم کرد، مێردەکەم زۆر کەم دەرامەت بوو،زۆر کات نان نەبوو بیخۆین، مێردەکەم دەستی کردە کارکردن رۆژ لە دوای رۆژ ژیانمان بەرەو خۆشی دەچوو، پاش ناخۆشییەکی زۆر بە دەست نەبوونییەوە، مێردەکەم بوو بە مقاول لە رووی ئابوورییەوە کێشەمان نەما، بەلأم ئەو جار جار پێی دەوتم کە منداڵمان نابێ، زۆر دڵی تەنگ ئەکردم زۆرم پێ ناخۆش بوو، نەمدەزانی چی بکەم کە سەیری ئەکردم نیگاکانی ئازاری ئەدام، مێردەکەم ئەم قینەی لە دڵمدا دروست کرد هەتا وای لێهات رقم لە هەموو دایکێك ئەبۆوە، هەمیشە باسی ئەوەی ئەکردو دەیوت خۆزگە کورێکمان ئەبوو ناوی منی هەڵدەگرت وچەند خۆش بوو؟! وەك ئەوەی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ پێم بڵێ تۆ هۆکاری بۆیە ئێمە منداڵمان نابێ، منیش هەستم بەوەکرد کە بوومەتە هۆکار بۆ ناڕەحەتی ئەو، بیرم لەوە کردەوە پێی بڵێم ژنێکی دیکە بێنێت تا منداڵمان ببێ، کە کاتێك پێم وت ڕازی بوو وتی: ژنێکی تر دێنم بەلأم لەگەڵ تۆدا بە درێژایی تەمەن دەمێنمەوە،

منیش لە بەرامبەردا هەستم بە هیچ ناخۆشییەك نەکرد لە ئەنجامدانی ئەم کارەدا حەزم ئەکرد منداڵی هەبێت، ئیدی ئەوە بوو کچێکی هێنا تەمەنی ١٧ ساڵ بوو لەگەڵیدا بۆ ماوەی چەند رۆژێك دیارنەما، سەردانی بۆ لای من زۆر کەم دەبۆوە سەرەرای ئەوەی خۆشەویستی و سۆزێکی زۆرم پێ بەخشی، رۆژێك هەڵسام چووم

سەردانی ژنە تازەکەی بکەم بینیم ژنەکەی منداڵە لە هەمان کاتدا سکی هەبوو، لە ناخەوە خەفەتم زۆر خوارد کە نەمتوانیوە من ئەو کەسە بم منداڵی پێ ببەخشم، هەر چۆنێ بێ من نابێ بەتەنها بمێنمەوە، داوام کرد لە ژنە تازەکەی بێت بە یەکەوە لەیەك شوقەدا بژین من دایکی ئەو منداڵەمو هیچ فەرقێکی نییە، هەر چەند مێردەکەم بەم کارە ڕازی نەبوو، بەلاّم فشارم خستە سەر ژنەکەی‌و ڕازیم کرد، ئیدی ئەوە بوو ڕازی بوو بەیەکەوە بژین من وام لێکدابۆوە لە لای خۆم کە ئەوان بێنە ئەوێ ئیتر ڕۆژانە دەتوانم مێردەکەم ببینم، کەچی بە پێچەوانەوە بە هیچ شێوەیەك منی بەسەر نەکردەوە، مێردەکەم تەواو لە دوای هێنانی ئەم ژنەوە گۆڕا، ڕۆژێکیان گلەیم لێ کرد وتی: ئاخر ئەو دایکی منداڵەمەو ناتوانم بەبێ ئەو بژیم بۆم دەرکەوت کە ئتر مێردەکەم لە دەستم دەرچووە وتم پێش ئەوەی خۆی‌و ژنەکەی من دەرکەنە دەرەوەو ڕەنج وهیوای ١٥ ساڵم بە فیڕۆ بچێت با من بیرێك لە خۆم وئایندەم بکەمەوە.

ڕۆژگار تێپەڕی هەڵسوکەوتی مێردەکەم لەگەڵ من زۆر ڕوو لە خراپی بوو، بیرم لەوە کردەوە ئەو منداڵەی لە سکیدایە لە ناوی بەرم‌و ژیانمان بگەڕێتەوە دۆخی جاران، ڕۆژێکیان چاوەڕێم کرد مێردەکەم بچێتە دەرەوەو ئەوەی لە خەیاڵمدا پلانم بۆ کێشا ئەنجامی بدەم، کە بینیم مێردەکەم چووە دەرەوە، منیش چووم بەرەو ژوورەکەی بینیم خەوتووە تووشی ڕاڕایی هاتم بیکوژم چۆن وابکەم منداڵەکەی لە بار بەرم خۆم پێ ڕانەگیرا فشارم خستە سەر سکی کە خەوتبوو دەستی کردە قیژەو هاوار منیش زیاتر فشارم ئەخستە سەر سکی، بەلاّم ئەم جارەیان بە پێوە، زۆر بە بەرزی هاواری ئەکرد تا هاوسێکان هەموو کۆبوونەوەو لە دەستمیان ڕزگار کردو ڕوانەی نەخۆشخانەی (أم المصريين) کرد،

چونکە تووشی نەزیف هاتبوو ناچار بوون منداڵەکەیان پێ لەبار برد.

ئەم ژنە تاوانبارە ئەم قسانەی لەبەردەم دادوەری لێکۆڵینەوەدا کردو تەواوی چیرۆکەکەی بۆ گێڕانەوە: بۆ ماوەیەك لە میانەی قسەکانیدا بێ دەنگ بوو وتی: بۆم دەرکەوت هەوێکەم وەك ئاگرێك بە ناو ناخمدا دێت و دەچێت، قەت نەگریاوم لە ژیانمدا ئەوەندەی ئەوکاتە گریام کە کاتێك پێی وتم بۆ منداڵەکەمت کوشت قەت لێت خۆش نابم تۆ منت لە خۆشی تەمەن بێ بەش کرد بۆ ئاخر؟ بۆ؟ خودایە قەت لە ژیاندا خۆشی نەبینیت خودا قەت لێت خۆش نابێ پاشان حاکم بڕیاریدا بە حەبس کردنی.

## پیاوێك داوای سێکسی ناشیاو لە خێزانەکەی ئەکات

سەرچاوەیەکی باوەڕ پێ کراو لە یەکێك لە ڕۆژنامە مەغریبیەکان ئەوەی بڵاو کردەوە کە ژنێکی مەغریبی بۆ ماوەیەك لە لایەن مێردەکەیەوە هەڕەشەی کوشتنی لێ ئەکرێت و پێی ئەڵێت: ئەبێت سەرت لێبکەمەوە، هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە داوای سێکسی نەشیاوی لێ کردووە، کە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە، شایەنی باسە ئەم پیاوە بۆماوەی چوار ساڵە لە یەکێك لە ناحییەکانی شاری فاسی مەغریبی دەژیت، هەروەها سەپەرشتی یەکێك لە مزگەوتەکانی ئەو شارە ئەکات پێ دەچێت سەر بەگروپێکی توندڕەو بێت، کاتێك ئەم ژنەی هێنا تەمەنی ژنەکەی چواردەساڵ بوو، چەند جارێك مێردەکەی داوای سێکسی ناشیاوی لێ کردووە، ئەویش بە هیچ شێوەیەك ڕازی نەبووە لە بەرامبەردا هەڕەشەی کوشتنی لێ کردووە، ژنەکەشی ناچار بووە لە دەستی هەڵبێت سەرچاوەکە ئەوەشی ڕوونکردەوە کە مێردەکەی کەوتۆتە دوایی هەتا ماڵی باوکی لە ناوچەی (عین عائشە) لە هەرێمی (تاونات) لەوێ بۆ ماوەیەك خۆی لەترسی مێردەکەی حەشارداوە. لە کاتێکدا لەسەر کانی جل وبەرگی دەشووشت مێردەگەی گەیشتە سەری و کەوتە لێدانی و سەری خستە سەر بەردێك و هاواری کرد الله اکبر بۆ ئەوەی سەربڕێ بەلاّم خۆشبەختانە بەرگری کرد وخوشکەکەشی لەگەڵ دوو کەس کە لەوێ بوون لەوکاتەدا توانرا ڕزگاری بکەن، ئەگەر ئەوان نەبان ڕەنگە بیکوشتایە.

بنکەی پۆلیسی (عین عائشە)ە پاش لێکۆڵینەوەو ئامادەبوون لە شوێنی رووداوەکە وەرگرتنی ئیفادەی شایەتەکان ژنەکەیان رەوانەی نەخۆشخانە کرد، بەشی فریاکەوتن بۆ چارەسەرکردنی ژنەکە، چونکە دەستی و قۆڵی پشتی هەموو برینداربوو بوو. هەوڵ و گەڕان دەستی پێ کرد بە دوای تاوانباردا، بەڵام مێردەکەی خۆی قوتار کرد جێگەی وەبیرهێنانەوەیە دوو جار هەوڵی دا بوو بیکوژێ. شەش ساڵە لەگەڵیدا پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجامداوە، دوو ساڵ لە ماڵی باوکی مێردەکەی ژیانیان بەسەر بردووە دواتر چوونەتە خانووی مزگەوتێك لە ناوچەی (عین شکاکە) کە ١٥ کیلۆمەتر دەکەوێتە باشووری خۆرئاوایی شاری فسەوە، بەدرێژایی ئەو هەموو ماوەیە نەیتوانیوە لە کارە چەپەڵەکانی خۆی رزگار بکات.

ژنەکە ئەوەی دووپات کردەوە کە لە ژیانێکی زۆر ناخۆشدا ئەژیا لەگەڵ مێردە ریش درێژەکەی هەر چەندە وتی نازانم پەیوەندی هەبووە بە گروپە توندڕەوەکانەوە یان نا، بەڵام سەرپەرشتی مزگەوتی کردووە دووکانێکی نزیك مزگەوتەکەی گرتۆتە دەست بۆ ئەوەی کاری سێکسی ناڕەوای تیادا بکات.

## مۆبایل و کێشەی نێوان ژن ومێردا

لە مەغریب لە گوندێکدا دەژیان، ژیانیان هەمووی خۆشی بوو ڕۆژانە بە ئاوازی گاڵتەو پێکەنینەوە بەرەو ماڵ ئەچوونەوە مەڕومالاَت و مانگایان بە خێوئەکرد، سەرەڕای کەمی خزمەتگوزاری لە گوندەکەیاندا، بەلاَم کێشەیەکی ئەوتۆیان نەبوو تا ئەوکاتەی ئامێرێك هاتە ناو ژیانیانەوە کە پێی دەوترێ (مۆبایل) ئیدی لێرەوە ناکۆکێکان دەستی پێ کرد، ژنەکە ڕۆژانە زۆر مۆبایلی بەکاری ئەهێنا پیاوەکە زۆر پێی ناڕەحەت ئەبوو.

ڕۆژێکیان پیاوەکە ئەگەرایەوە ماڵەوە بەدرێژایی ئەو ڕۆژە مۆبایلەکەی زەنگی لێدەدا لە بەرامبەردا ژنەکە داوای لێ ئەکرد کارتی بۆ داخڵ بکات، چونکە پالاَنسی تیادا نەماوە، جارێك تا دوو جار ئەم قسەیەی لێ دووبارە کردەوە، لە ناکاو پیاوەکە تووشی تووڕەبوونێکی توند هات دەستی دەایە چەقۆیەك و کەوتە گیانی ژنەکەی ئەوە بوو لە ئەنجامی لێدانێکی زۆر گوێی چەپی و دەماری دەستی ڕاستەی بڕی و هەموو دەموچاوی وەکو خەریتە لێ کرد، بەخێرایی ڕەوانەی نەخۆشخانە کرا ئێستا لە ژێر چاودێریدایە. هەروەکو ڕۆژنامەی (الرأی العام) ی کوێتی ئەم هەواڵەی لە یەکێك لە لاپەڕەکانیدا بلاَو کردەوە.

کۆمەڵەی داکۆکی کردن لە ژنان داوایەکیان بەرزکردەوە بۆ دادگا دژی مێردی ئەو ژنە مەغریبیەی کە تەمەنی ٣٥ ساڵەو بە دەستی مێردەکەی دەست درێژیەکی زۆری کراوەتەسەر، ئامەو چەندین ڕووداوی تر لە ئەنجامدانی خراپ بە کارهێنانی ئامێری مۆبایل.

# بە چەند دۆلارێکی ئەمریکی فیلمێکی عەرەبی سێکسی دەرئەهێنن

فیلمی یوسف و فاتمە دونیاو ولآتانی عەرەبی و تەنانەت ولآتی عیبریشی هێنایە هەژاندن، پێش دووسالْ لە دەرهێنانی ئەم فیلمە کێشەیەکی گەورەی نایەوە، لە ولآتانی عەرەبیدا بە تایبەتی لە شاری (الطیرة) شوێنی لەدایك بوونی هەر دوو پالْەوانی فیلمەکە، بە پێی بۆچوونی هەندێك فیلمی لەم جۆرە نامۆیە بە ولآتانی عەرەبی، چونکە کلتووری ولآت و خەلْکی ئەم جۆرە کارە قبوولْ ناکەن، لە بەرامبەر ئەم کارە نامۆیەدا هەر دوو پالْەوانی فیلمەکە بەردەباران کران لە لایەن جەماوەری ولآتانی عەرەبییەوە، پاش ئەوەی ئیهانەیەکی زۆر کران ئینجا ڕەوانەی نەخۆشخانە کران.

شایەنی باسە کۆمپانیا سەهیۆنێکان بەم دواییە هەموو هەولێك ئەدەن بۆ دەرهێنانی فیلمی سێکسی عەرەبی و بە هەماهەنگی لەگەلْ ئەکتەرە جوولەکەکان، چونکە ئەم جۆرە فیلمە ڕواجێکی زۆری هەیە لە ولآتانی عەرەبی هەتا تەنانەت لە لای خودی جوولەکەکانیشەوە ڕەواجێکی باشی هەیە.

یەکەم فیلم بەبەشداری جولەکەو عەرەب بەرهەم هێنرا، فیلمی چوارگۆشەی خۆشەویستی بوو کە پێش ٧ مانگ لەمەوبەر دابەزایە بازاڕەوە، تیادا چەندین ئەکتەری بەناوبانگی عەرەبی وجوولەکە بەژداریان کرد.

ڕۆژنامەی (لیلك) کە بە زمانی عەرەبی دەرەچێت ئەوەی بلاّو کردەوە، کە فیلمی داهاتووی لەوجۆرە فیلمی سابرین ئەبێت پاڵەوانە سێکسێکەشی لە شاری قوودسی داگیرکراو ئەبێت، بەلاّم ئێمە ئەوە دووپات ئەکەینەوە کە ئەو ناوە ناوێکی خوازراوە ناوی ئەکتەری بەناوبانگی میسری سابرین نییە، لەمبارەیەوە کۆمپانیا یەهوودیەکان ئەوەیان بلاّو کردەوە کە فیلمی سابرین ڕواجێکی زۆری ئەبێ لە لای جەماوەی عەرەب و جوولەکەش هەر چەندە سابرین ناو ئامادە نەبوو چاوپێکەوتن لەگەڵ ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا ئەنجام بدات.

لە ڕاستیدا زۆرێك لەو فیلمانە بە کۆمەڵێك کچی دەرکراوی شارو شارۆچکە عەرەبەکان دەرئەهێنرێت، بەتایبەتی ئەو کچانەی کە لە ماڵەوە تووشی لێدان و ئیهانەکردن دێن لە دەستی ناخۆشی ژیان ڕائەکەن و ڕوو ئەکەنە تەل ئەبیب و لەوێ کۆمەڵێك کۆمپانیا ڕایاندەکێشنە لای خۆیان.

ڕۆژنامەنووسێك لە ڕۆژنامەی (لیلك) پرسیاری ئاڕاستەی یەکێك لەو کچانە کرد ئەویش بەمشێوەیە بوو:

چۆن قبوڵ ئەکەی لەگەڵ پیاودا درێژ بیت سێکسیان لەگەڵدا بکەی لە بەرچاوی کامێرا؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی من ئازادیم ئەوێت سەرەتا زۆر سەخت بوو، بەلاّم هاوڕێی دەرهێنەرەکەم زۆر هانی دام.

یەکێکی تر لەو کچانە بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: من لەگەڵ پیاودا درێژ ئەبم وئەخەوم لە پێناو هونەردا وا ئەکەم (هونەر پاکە پێویستی بە کەسی داوێن پیس نییە) هەست ناکەم چی ڕوودەدات کاتێك لەگەڵ پیاوێکدا ئەخەوم، چونکە خەوتنی ڕاستی تەنها لەگەڵ خۆشەویستەکەمدا هەستی پێ ئەکەم و چێژی لێ وەردەگرم.

بە هەر حاڵ هەر کچێك لەبەرامبەر دەرهێنانی فیلمێك لەو جۆرە یان بەژداری کردنی لە فیلمەکەدا

٢٠٠٠-٥٠٠٠ دولار ئەمریکی وەردەگرێت. زۆرێك لەو کچ و کورە هەڵهاتووانە روو ئەکەنە شارە عیبرێکان لەوێ دەژین و نازناو لە خۆیان دەنێن و تووشی دەیان کاری خراپ ئەبنەوە وەك بەکارهێنانی مادە هۆش بەرەکان، کردنی سێکسی نا شەرعی و ئەمەش بۆ کەم کردنەوەی جەماوەری بزوتنەوە ئیسلامییەکان لە ناوچەی فەلەستین و وڵاتانی عەرەبی بە گشتی.

# کاتێك مرۆڤ خۆی وپەیامەکەی لە ژیان لە بیر ئەکات چی روو ئەدات؟!

کاتێك تەمەنی ١٢ساڵ بوو براکەی کە لە پێستی مرۆڤدا دەرچوو بوو بە گورگ و دەست درێژی لە خوشکەکەی خۆی کرد، رۆژێك لە حەمام خۆی ئەشوشت هاتە دەرەوە داوای لە خوشکەکەی کرد قژی بۆ شانە بکات لە کاتی شانەکردندا لە سەر چۆکی ئەخەوێت یان خۆی ئەکاتە خەو ڕاستەوخۆ داوای سێکسی لێ ئەکات ئەویش قبووڵی ناکات و ئەو کارە ڕەت ئەکاتەوە بەلاَم بە زۆر لێکردن و فشار خستنە سەرو هەڕەشەکردن بە کوشتن کچێنی پێ لە دەست ئەدات دوای ئەوەی دایکی لە دەرەوە دێتەوە کچەکە چۆنێتی رووداوەکە بۆ دایکی ئەگێڕێتەوە کەچی دایکی لە بەرامبەردا ئەڵێت وس قسەی وا نەکەی تۆ هێشتا کچی لە لای هەر کەسێکیش ئەم قسەیە بکەیت ئەبێت زمانت ببڕم.

بەم جۆرە کچەکە مایەوە پاش ماوەیەك داکی ئەیفرۆشێت بە کەسێك رۆژێکیان کەسێك دێت بەناوی میوانی بۆ ماڵیان، کەچی هەر چاوی دایکی لە کچەکە ون ئەبێ، ئەو کەسەی کە گوایە میوانە دەستی کردە هەڕەشەکردن لە کچەکە ئەگەر بێتوو سێکسی لەگەڵ نەکا ئەوا بە چەقۆ دەیکوژێت، هەمان کەس پاش تێپەڕبوونی هەشت مانگ ئەیخوازێت و لەبەرامبەر هەزار دۆلار ئەمریکی ئەیفرۆشێت، پاش ماوەیەك دەزگاکانی پۆلیس ئەم هەواڵەیان بە دەست گەیشت و ڕاستەوخۆ کەوتنە

لێکۆڵینەوە، سەبارەت بەم تاوانە گەورەیە دەرکەوت کە پێنج کەس دەستیان هەیە لەم تاوانەدا دایك وباوك وبرا خاوەن خانووەکەو و مێردی کچەکە، برا هەر لە ١٢ ساڵیەوە بوو بە شەماڵێك و گوڵی باخچەی بەهاری هەڵوەراند، باوکی تاوانبار بەهەموو شێوەیەك ڕێگە خۆش کەر بوو بۆ تاوانباران، دایك ئەی دایکی بێ ئیمان دەستی هەیە لە فرۆشتنی کچەکەی بە خاوەن ئوتێلێك هەموو مانگێگ لەگەڵ مێردەکەی بە قاقای پێکەنینەوە پارەی کچەکەیان وەردەگرت لەبەرامبەر چی لەبەرامبەر فرۆشتنی لەشی کچەکەی، مێردەکەی تاوانباری سەرەکی لەبەردەم بازرگانی کردن بە لەشی خێزانەکەیەوە، هەروەها خاوەن خانووەکە کەرێگەی بۆ خۆش ئەکردن و بێ دەنگ بوو لەبەردەم ئەنجامدانی ئەم کارەدا.

بەپێی مادەکانی تاوانکردن مێردەکەی نۆ ساڵی بۆ برایەوە لە زیندانی ئیشە قورسەکان، خاوەن خانووەکەش ٢١ساڵی بۆ برایەوە لە زیندانی ئیشە قورسەکان، هەروەها ١٠بۆ مێردەکەی بە تۆمەتی دەست درێژی سێکسی، دایکی وباوکی و خاوەن خانووەکە هەر ئەبێت ساڵێك لە تاریکای زینداندا ئازار بکێشن، چونکە تاوانبار ئەمرۆ یا سبەی ئەبێت بگات بە سزای خۆی، چونکە تاوان هەرگیز هەتا سەر نییە مرۆڤ هەر چەندە تاوان بکات رۆژێك ئەبێت ملی لە پەتی سێدارە گیر بکات .

## دیاردەی بوونی خزمەتکار لە نێو ماڵاندا چی لێ ئەکەوێتەوە؟

بوونی خزمەتکاری کچ و ژن لە نێو ماڵەکاندا بۆتە هۆکاری نانەوەی کۆمەڵێك کێشەو گرفت لە ماڵانەدا، ئەم دیاردەیە زۆرێك لە ڕای گشتی و لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکانی گرتۆتەوە، لێرەدا سەبارەت بەم دیاردەیە چیرۆکێکی کورتان بۆ ئەگێڕمەوە کە پەیوەندی بەم بابەتەوە هەیە: کچێکی خزمەتکار لە ماڵێك کار ئەکات ئەو ماڵە سێ منداڵیان ئەبێت بێگومان ئەم هەمیشە لە ماڵەوەیە، تازە ئەم بۆتە دایکی دووەم لە ماڵەکەدا، ئەم کچە لەگەڵ کوڕێکدا بەناو خۆشەویستی ئەکەن بەلاَم ڕێك ئەکەون کە بەیەکەوە سێکس ئەنجام بدەن هەموو ڕۆژێك کوڕەکە دێتە ماڵەوەو ئەوەی خوا پێ ناخۆشە ئەیکەن لە ژووری خەوتنی ئەو ماڵەدا، جگە لەمەش ڕۆژانە، هەر سێ منداڵەکە فێرئەکات بەیەکەوە سەیری فیلمی سێکسی بکەن، پاش ماوەیەك یەکێك لەو منداڵانە کە وەك ئەوانی تر نەبوو ئەم گەورەتر بوو کاتێك دایکی دێتەوە ماڵ ئەویش تەواوی بابەتەکەی بۆ ئەگێڕێتەوە ئەویش ڕاستەوخۆ ئەکەونە چاودێری کردنیان هەتا ڕۆژێك هەر دووکیان بەیەکەوە ئەگرن کە هەر دووکیان ڕووتن پاشان پۆلیس ئاگادار ئەکەنەوە دادگاش پاش لێکۆڵینەوەیەکی چڕوپڕ حوکمی زیندانییان بۆ دەرئەکات بۆ ماوەی پێنج ساڵ بە تۆمەتی زینا کردن لەبەر چاوی منداڵانی ئەو ماڵەی کە کاری تیادا کردووە.

## بەدڕەوشتی لە لای عەرەبی سعوودی لە پەرەسەندندایە!

کچێکی سعوودی تەمەن ١٢ساڵ لە شاری مەدینە بۆ ماوەیەك باوکی بە ترس و تۆقاندن و لێدان وهەڕەشەکردن بە سووتان دەست درێژی سێکسی لێ ئەکات. باوکەکە تەمەنی ٤٠ساڵە بە شێوەیەکی بەردەوام لە ژووری کچەکەیدا کاری سێکسی لەگەڵ ئەنجام ئەدات، هەر چەند کچەکە منداڵە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کارەی باوکی ڕەت کرشۆتەوە، باوکەکەی بە ترس وتۆقاندن هەڵیخەڵەتاندووە کە کارێکی لەو جۆرەی لەگەڵ بکات هەمیشە نموونەی ئەوەی بۆ هێناوەتەوە کە کچێك هەبوو باوکی داوای سێکسی لێ ئەکرد بەڵام کچەکەی ڕازی نەدەبوو باوکەکەشی لە بەرامبەر ڕازی نەبوونی کچەکەیدا هەڵسا کچەکەی خۆی لە ژوورەکەی سووتاند.

بەم نموونەیە کچەکەی خۆی ئەترساند . بۆ وروژاندن و بزواندنی هەستی سێکسی کچەکە بە بەردەوام کۆمەڵێك کرداری سێکسی پێ نیشانداوە کە لە ناو مۆبایلەکەیدا خەزنی کردووە .

پاش چاودێرییەکی هێمنانە لەلایەن هێزەکانی پۆلیسەوە توانرا باوکی کچەکە بە رووتی لەگەڵ کچەکەدا دەست گیر بکرێت.

هەر لەو ژوورەدا تاوانبار چەند بەڵگەیەکی لە دوای خۆی بە چێ هێشتبو وەك بڕێك مادەی هۆش بەرو چەند شتێکی تری لەو جۆرە، هەر چەندە لایەنی لێکۆڵەوەر لە دوایدا بۆیان دەرکەوت کە تاوانبار باوکی کچەکەیە هەر وەکو کچەکە لە ئیفادەکەیدا باسی لێوە کردووە.

پۆلیسی بنکەی (العقیق) بەم کارە هەڵساوە دادوەری گشتی بەم شێوەیە وەسفی ئەم کارە ئەکات ( گەورەترین، خراپترین فەساد لە سەر رووی زەوی ئەم کارەیە).

# فاڵچییەکی مەغریبی دەست درێژی سێکسی ئەکاتە سەر کچەکەی

پۆلیسی دادوەری لەلێکۆڵینەوەیەکدا لە شاری (أغادیر) لە مەغریب فاڵچییەك دەستگیر ئەکات بە تۆمەتی دەست درێژی سێکسی بۆ سەر کچە تەمەن هەژدە ساڵەکەی، پۆلیس بە پشت بەستن بە گومانی هاوسەرەکەی گەیشتنە تەواوی ڕاستییەکان، هاوسەرەکەی گومانی ئەوەی لێ ئەکرد کە پەیوەندییەکی سێکسی لە نێوانیاندا هەبێ.

شایەنی باسە پیاوەکە تەمەنی ٤٣ساڵەو بەم کارە هەڵساوە، تاوانبار لە میانەی لێکۆڵینەوەدا دانی بەوە دانا کە دوو جار وەکو ژن ومێردێك پرۆسەی سێکسی لەگەڵ ئەنجامداوە، بەتایبەتی لەو کاتانەی هاوسەرەکەی لە ماڵەوە دەچووە دەرەوە بۆ سەر کارەکەی کە لە یەکێك لە کارگەکاندا کاری ئەکرد. پە پێی هەواڵی ڕۆژنامەکە کچە گەورەکەی ئەوەی ڕاگەیاندووە باوکی کۆمەڵێك شتی فاڵچێتی لەبەردەم ئەنجام ئەدا تا ئاگای لە خۆی نەدەما، لە پاشان وازی بە چەستەی ئەکرد.

لێکۆڵەوەران بە دوای ئەم کەیسەدا لە ماڵی تاوانبار کۆمەڵێك بەڵگەیان بە دەست کەوتووە، کە بەڵگەن لەسەر ئەنجامدانی کارێك لەو جۆرە وەك کۆمەڵێك کەرەستەی فاڵچێتی.

بەڵام ئەوەی کە بەلای هەمووانەوە سەیر بوو، ئەوە بووە تاوانبار کۆمەڵێك پاساوی بۆ کارە دڕندانەکەی ئەهێنایەوە لە میانەی لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا گوایە بۆیە ئەم کارەی لەگەڵ کچەکەی ئەنجام داوا

لە ترسی خۆی بووە لە سەر ئاییندەی کچەکەی نەکا کاروانی زەواج بە جێی بهێڵێت، لە کاتێکدا کە تەمەنی ١٨ ساڵەو بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش جنی بە کار هێناوە گوایە جنێکە پێی وتوە ئەبێت لەگەڵیدا بخەوێت ئەگینا لە زەواج دوا ئەکەوێت.

# ژنێك ڤێلاكەی ئەكاتە شوێنی لەشفرۆشی

پۆلیسی نەهێشتنی تاوان و پاراستن لە وەزارەتی یەكێك لە وڵاتە عەرەبییەكان دەستی گرت بەسەر ڤێلای ژنێكدا كە بەمەبەستی لەشفرۆشی بە كاری ئەهێنا، پاش لێكۆڵینەوەیەكی ورد دەركەوت كە ئەو ژنە بۆ ماوەیەكە ڤێلاكەی بۆ ئەم جۆرە كارە بەكار ئەهێنا، نەك تەنها هەر ئەوەندە بەڵكو كۆمەڵێك كچی هەرزەكاری تەلاق دراوی پێوەژنی قۆرخ ئەكرد، كە تەمەنیان لە نێوان ۲۳ بۆ ۳۵ە هەروەها سەرچاوەكە ئەوەشی ڕاگەیاند زۆربەی ئەوانەی ئەم كارەیان لەو ماڵەدا ئەنجامداوە ئەو عەرەبانە بوون كە بەمەبەستی گەشت و گوزار روویان كردۆتە ئەو وڵاتە.

پرۆسەكە پاش لێكۆڵینەوەیەكی ورد و چاودێرییەكی توند توانرا دەست بگرن بەسەر ئەو ماڵەدا، كاتێك ئەم ڕاستییە دەركەوت هاوكات بوو لەگەڵ كوژرانی گەنجێك لە پارێزگاكەدا كە پێشتر ئەو گەنجە پەیوەندییەكی ڕاستەوخۆی هەبووە بەوتاوانبارەوە، پاش ماوەیەك لە لێكۆڵینەوە ژنە تاوانبارەكە ڕەوانەی تەوقیف كرا.

جێگەی ئامارە پێ كردنە پۆلیسی نەهێشتنی تاوان وپاراستنی ڕەوشت چەندین پرۆسەی لەم جۆرەی ئەنجامداوە بەتایبەتی رۆڵێكی گرنگیان هەبووە لە پێناو نەهێشتنی تاوان وماڵە لەشفرۆشەكەكان.

## بەرپرسی نەخۆشخانەیەك لەگەڵ یەکێك لە ناخۆشەکانیدا بەرووتی دەست گیر ئەکرێن

لایەنە ئەمنیەکان بەرپرسێکی نەخۆشخانەیەك دەست گیر ئەکەن لە کاتێکدا کە بەتاوانی زینا هەڵدەستی لەگەڵ یەکێك لە نەخۆشەکانی. پاش دەست گیر کردن کەیسەکەیان ڕەوانەی لایەنی تایبەت کرا بۆ لێکۆڵینەوەی ورد تیادا، شێوازی جۆنێتی تاوانەکەش بەم شێوەیە بوو، لە کاتێکدا پیاوانی پۆلیس لە یەکێك لە گەڕەکەکاندا ئەسوورانەوە پیاوێکیان بینی خەریکی تاوان کردن بوو لەگەڵ کچێکێدا، لە کاتی ئەنجامدانی تاوەنەکەدا دەستگیر کرا، لە پاش لێکۆڵینەوەیەك دەرکەوت کە بەرپرسی نەخۆشخانەیە لە پارێزگاکەدا، ئەمەش بووە هۆی نانەوەی دڵە ڕواکی لە لای نەخۆشەکانی نەخۆشخانەکە لە پاش لێکۆڵینەوە بەرپرسەکە ڕەوانەی زیندان کرا.

## کچێکی ١٧ساڵ دان بە تاوانەکانیدا ئەنێ!

پاش ئەوەی لە ماڵەوە بزر ئەبێ بۆ ماوەیەك، خۆی تەسلیمی پۆلیس ئەکات، کچێکی تەمەن ١٧ساڵە هێشتا لە قۆناغی هەرزەکاریدایە، باوکی کچەکە بەم هەواڵەی زانی حاشای لێ کرد. ماڵەوە زۆر بەدوایدا ئەگەڕان، بەلام هیچ زانیاریەکیان سەبارەت بە کچەکەیان دەست نەکەوت، پاش ماوەیەك لە بزربوونی خۆی تەسلیمی بنکەی پۆلیس ئەکات، کاتێك باوکی بەم هەواڵەی زانی حاشای لێ کردو سەرەتا ئامادە نەبوو پیاوانی پۆلیس بیبەن وتی:، چونکە ئەم کچە شایەنی ئەوە نییە هەڵگری ناوی من بێت.

سەرچاوەکە ئەوەشی ڕاگەیاند کە کچەکە لە بەردەم لێکۆڵینەوەدا دانی بە هەموو وردە کارییەکانی بزر بوونی لە ماڵەوە ڕاگەیاندووەو چۆنێتی دەرچوونیشی بەم شێوەیە گێڕایەوە ئەڵێت: سەرەتا لەگەڵ یەکێك لە ڕەفیقە کۆنەکانی چۆتە دەرەوە کە ماوەیەکە یەکتری دەناسن، دواتر تووشی جووت بوونی سێکسی بووە لەگەڵ ١٢ کوڕ، ناوو شوێنی ئەو کوڕانە هەموو ئەزانێ، بەلام سەبارەت بە پاساو هێنانەوەی بۆ کارەکانی گوایە ترساوە لە سزای ماڵەوە بۆیە نەگەڕاوەتەوە نەکا باوکی یا کەسێکی تر بە شێوەیەك لە شێوەکان ئازاری بدەن وای بەباش زانیوە لەگەڵ ئەو کوڕانەدا چەند شەوێك بەرێتە سەر لە پاش داپێدانانەکانی کەیسەکەی ڕەوانەی دادگا کرا.

# کرێکارێکی بەنگلادیشی لە جدە کچێکی حەوت ساڵ لاقە ئەکات

پۆلیسی پارێزگای جدە کرێکارێکی بەنگلادیشی دەست گیر کرد بە تۆمەتی دەست درێژی سێکسی بۆ سەر کچێکی حەوت ساڵ، لە کاتێکدا کرێکارەکە خۆی تەمەنی ٢٤ ساڵە کە لە یەکێك لە قوتابخانە سەرەتاییەکانی جدە کاری پاکردنەوەی ئەکرد، لە کاتێکدا ئەم رووداوە روویدا کاتی تەواو بوونی وانەکانیان بووە لە قوتابخانەو گەڕانەوەیان بۆ ماڵەوە، ڕاستەوخۆ پۆلیس کەیسەکەی ڕەوانەی دەستەی لێکۆڵینەوەو دادوەری گشتی کرد بۆ بە سزا گەیاندنی کرێکارەکە.

کاتێك بەڕێوەبەری قوتابخانە بەم دەست درێژییەی زانی هیچ کارێکی دژ بەو کرێکارە بەنگلادیشییە ئەنجام نەدا، بەڵکو بۆی شاردەوە، چونکە هەر وەك لە دوایدا دەرکەوت هیچ بەڵگەیەکی نیشتەجێبوونی نەبووە لەو وڵاتەدا، بەڵکو بە شێوەیەکی ساختە لەو شارە ماوەتەوە، بەڵام باوکی کچەکە سوور بوو لەسەر ئەوەی ئەبێت ڕەوانەی دادگا بکرێت بە زووترین کات بگاتە سزای خۆی.

لەلایەکی ترەوە دەستەی مامۆستایان لە قوتابخانەکە کۆبوونەوە بۆ قسەکردن لە سەر ئەم بابەتە مامۆستای زانستی کۆمەڵایەتی لە زانکۆی مەلیك عەبدوولعەزیز سەبارەت بەم رووداوە وتی: تاوانبار ئەبێت دوو جار سزا بدرێت جارێك لە بەر ئەوەی موسوڵمانەو ئەوی تر لەسەر تاوانەکەی .

لە ڕاستیدا ئەم دیاردەیە زۆرێك لە وڵاتانی گرتۆتەوە تا ئەو ئاستەی بووە بە دیاردەیەکی جیهانی ئەویش بە هۆی بوونی کرێکارێکی عازەبی زۆر، هەر وەها کیشەی یاسای کۆچبەرانو کیشەی دەرگا کردنەوە بە رووی هەموو تاکێك کە سەرو سیمای موسوڵمانی پێوە دیارە، ئەمەش هەڵەیەو روودانی تاوانێك لەم جۆرە دژی ئایینو یاساکانی سرووشتە.

## بچووکی تەمەنی قۆرخ کرد بۆ کاری سێکسی

دادگای گەورەی تاوانەکان فەرمانگەی دووبارە کردنەوەی بڕیار حوکمی یەك مانگ زیندانی سەپاند بەسەر ژنێکی تەمەن ٣٥ساڵدا بە تۆمەتی قۆرخ کردنی منداڵێکی تەمەن ١٤ ساڵە بۆ کاری سێکسی هەروەها دادگا بڕیاری ئەوەیدا سزاکەی بۆ بکرێت بە ٣ ساڵ.

ئەم ژنە لە ڕێگەی کوڕی خوشکیەوە کە لەگەڵ ڕەفیقە تەمەن چواردەساڵەکەیدا بۆ یاری کردن دەهاتەماڵیان، تاوانبار لەگەڵ باوکێکی پیردا ژیانی بەسەر ئەبرد، ڕۆژێك فێڵی لێ ئەکات ئەیباتە ژوورەکەی خۆیو هەندێك فیلمی ڕووتی پێ نیشان ئەدات لە پاشان دەست ئەکات بە کردنی کرداری سێکسی لەگەڵیدا منداڵەکە بەم شێوەیە فێری ئەم کارە ئەکات تا ئەو ئاستەی کە ناتوانێت ئیدی لە ماڵەوە بمێنێتەوە، شەوانە ڕائەکاتو دێتە لای ئەم ژنە تەمەن ٣٥ ساڵە، بەلاّم ماڵەوەی هەمیشە لە چاودێریدا بوون، پاش هەندێك گومان کە لە دوایدا هەموو شتێکیان بۆ دەکەوتو ئەوانیش ڕاستەوخۆ پۆلیسیان لەم کارە ئاگادار کردەوە بە تۆمەتی ئەوەی ڕێگەی خراپی فێرکردووە ئەیەوێت لە ڕێگەی ڕاست لای بدا.

# خێزانێك فشار ئەخاتە سەر خزمەتكارێكی ماڵەوەیان بۆ كاری سێكسی

لاقەكردنی كچێكی تەمەن ١٥ساڵ و وفشارخستنە سەری بۆ ئەنجامدانی كاری سێكسی ئەبێتە هۆی نانەوەی شۆڕشی خزمەتكاران بە مەبەستی هاوسۆزی لەگەڵ هاوڕێكەیاندا، هاوكات كۆمەڵەی مافی مرۆڤو چەندین خێزانی تر ئیدانەی ئەم كارەیان كرد، داوایان كرد بە توندترین شێوە لە لایەن دادگاوە ئەو ژن وپیاوەی كە ئەم كچە لە ماڵەكەیاند كار ئەكات سزا بدرێن.

رووداوەكە پاش ئەوەی پۆلیس هەندێك زانیاری لەمبارەیەوە سەبارەت بەو كارە دەست كەوت لە ئەنجامدا دەركەوت "ب ج" ی تەمەن ١٥ ساڵ لە لایەن خێزانی ئەو ماڵەی كە كاری تیادا ئەكات كاری لەشفرۆشی پێوە ئەكرێت و بەشێوەیەكی زۆرو بە بێ ئەوەی نووسینگە هیچ زانیارییەكی هەبێت لەمبارەیەوە، هەڵبەتە بە هەماهەنگی لەگەڵ كۆمەڵێك تاوانباری تر، هەروەها رۆژنامەكە ئەوەشی ڕاگەیاند كە لە ڕاپۆرتی تاقیگەی تاوان ئاماژەی بەوە كردووە كە ئەم كچە لە چەند جێگایەك روو بە رووی دەست درێژی بۆتەوەو هەروەها ئاماژەی بەوەش كرد باری تەندروستی خراپە ئەویش بە هۆی خواردنی ڕێژەیەكی زۆر لە حەبی قەدەغەكردنی سك پڕیو هەروەها چەندان جۆری حەبیان دەرخواردداوە بۆ تێكچوونی هەستی سێكسی لە لای كچە بۆ ئەوەی بتوانێت لە رۆژێكدا چەند جارێك سێكس ئەنجام بدا.

ئێستا خێزانێکی تر کچەکەیان گرتۆتە ئەستۆی خۆیان تا ئەو کاتەی لێکۆڵینەوە لەگەڵیدا دیتە تەواو بوون، سەرچاوەیەك ئەوەی راگەیاند تا ئێستا تاوانباران ئازادن تەنها مێردی ژنەکە نەبێ دەست گیر کراوە، بەلاّم هاوسەرەکەی کە دەستی هەبووە لە تاوانەکەدا بە کەفالەت لە بەرامبەر ٧٠٠٠دۆلار رەوانەی دادگای تاوان کراوە.

پۆلیس پێش دوو رۆژ پرۆسەیەکی ئەنجامدا بۆ بەدوادا چوون بە دوای کەسانی تاوانباردا، لە دوکانێکدا کە بۆ چەند جارێك ئەم کچە تیادا لاقە کراوە سێ کەس دەست گیر کران، کە دەستیان هەبوو لە تاوانی دەست درێژی سێکسی.

لە بەرامبەردا دانیان بەوە داناوە کە ئەو خێزانەی کاری بۆ کردوون وەك کالاّیەك نرخیان بۆ داناوە لە ١٠ تا ٥٠دۆلار لە بەرامبەر هەر جارێك لە جووتبوون، بەلاّم لەلێکۆڵینەوەکەدا ئەوە دەرکەوت لە ماوەی ٢٤ حووزەیران بۆ ١٥ تشرینی یەکەم کچەکە تەنها ٧٥ دۆلاری دراوەتێ مووچەی مانگانەکەشی تەنها ١٠٠ دۆلارە بووە.

لە بەرامبەر ئەم کارەدا ئەندامی دامەزرێنەری کۆمەڵەی داکۆکی لە مافی کۆچبەران داوای لە لایەنی پەیوەندی دار کرد بە شێوەیەکی توند تاوانباران سزا بدرێن، پارێزەری کۆمەڵەکە ئامادەیی خۆی نیشاندا بۆ بەرگری کردن و داکۆکی کردن لە مافەکانی لەبەر ئەوەی نموونەی ئەم کچە نموونەی هەموو ئەو کچانەیە کە لە نێو ماڵەکاندا سەرەڕای کار کردنیان دەست درێژی سێکسیشیان دەکرێتە سەر، لە لایەکی ترەوە باڵوێزخانەی ولاّتەکەی ئامادەیی ئەوەی پیشان دا چاودێری تەواوی بکات تا ئەو کاتەی تاوانباران دەگەنە سزای خۆیان.

# بووکێك بە کۆمپیوتەر لە هەفتەی یەکەمی زەواجیدا خیانەت لە مێردەکەی ئەکات

(م. م) گەنجێکی تەمەن ٢٦ ساڵە لە زانکۆ کچێکی دەست نیشان کرد بیکاتە هاوبەش‌و هاوسەری ژیانی، ئیدی ژیان لەگەڵ ئەودا بەرێتە سەر، کچەکە زۆر جوان بوو، جوانییەکی لە ڕادە بەدەر، کوڕەکە مارەییەکی زۆری بۆ دانا کە لە دەستە خوشکەکانی زیاتر بوو نزیکەی ٢٥ هەزار دۆلاری بۆ دانا سەرەڕای ئەوەی تەواوی پێداویستییەکانی ماڵەوەشی بۆ دابین کرد لەگەڵ شوقەیەکەی بێ وێنەدا.

ئاهەنگی زەواجەکەیان بەسەر چوو، ڕۆژی یەکەم‌و دووەم تێپەری لە ڕۆژی سێیەمدا مێردەکەی بینی هاوسەرەکەی لە سەر کۆمپیوتەرەکەیەتی، بوونی ئەو لە سەر کۆمپیوتەر شتێکی ئاسایی بوو بەلای مێردەکەیەوە، چونکە هاوسەرەکەی زۆر بە باشی لە کۆمپیوتەرەی ئەزانی لە بەر ئەوەی کاتی گواستنەوەکەی لە کاتی دەوامی زانکۆدا بوو بۆیە زۆری بەلاوە ئاسایی بوو، وای ئەزانی وانەکانی بەسەر ئەکاتەوە، پێی باش بوو خوێندنەکەی تەواو بکات.

لە کۆتایی هەفتەی پرۆسەی هاوسەرگیریندا هاوسەرەکەی گەڕایەوە بۆ سەردانی ماڵەوەیان مێردەکەی لەم ماوەیە کە لە ماڵەوە بوو هاوسەرەکەشی لە ماڵی باوکی بوو، چووە سەر کۆمپیوتەرەکەی بۆ ئەوەی چەند دۆکیومێنتێکی پێویست بە کارەکەی ڕێکبخاتەوە، بەڵام دەرکەوت وەك بڵێت گرفتێك لە کۆمپیوتەرکەیدا هەبێت یان ڤایرۆس

لێی دابیٚ هەر بۆیە هەڵسا بە گەڕانەوەی کۆمەڵێك شت لە میانەی کۆنترۆڵکردنی فایرۆسەکەدا شتێکی لە ناکاو دەکەوت کە ژیانی لە بەر چاو ڕەش کرد خۆشی زەواجەکەی کرد بە مەئەساتێکی بەردەوام .

مەلەفێکی دۆزییەوە کە تازە خەزن کرابوو بە ناوی (ماسنجەر) مەلەفێکە بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی هەموو ئەو قسەکردن وپەیوەندییان دەپارێزی کە بەکارهێنەری کومپیوتەرەکە ئەنجامیان ئەدات، کاتێك مەلەفەکەی کردەوە کۆمەڵێك لەو پەیوەندییانەی تیادا بینی کە بە بەروار لەگەڵ ئەو ڕۆژە ڕێکەوتە کە ژنەکەی هاتە سەر کۆمپیوتەرەکە، چەند تراکێکی قسەکردنی کردەوە قسەکردنێکی گوێ لێ گرت لەگەڵ پیاوێکدا قسە ئەکات هەموو وردەکارییەکانی یەکەم شەو باس ئەکات و پێی ئەڵێت: ئاخر تۆ دوا کەوتی نەهاتیتە پێشەوە بۆیە منیش ناچار بووم شوو بکەم، هەروەها پەیوەندییەکی تری گوێ بیست بوو کە بە کەسێك ئەڵێت: هەر بگەڕێمەوە دەوام ئامادەم لەگەڵت بم خۆ ئەو پیاو نییە! لەو پەیوەندییە بەم شێوەیە وەسفی مێردەکەی ئەکات، لە پەیوەندی سێیەمدا پێی ئەڵێت خۆشم ئەوێت بڕوا بکە، بۆیە بەم زەواجە ڕازی بوومە تەنها لە بەر ئەوەی لە کۆت وبەندی ماڵەوە ڕزگارم بێت .

مێردەکە دەیخوێندەوەو لەگەڵ هەر پیتێکدا ئازارو ئاهی هەڵدەکێشا بۆ ئەوەی کە فێڵی لێ کراوە لە لایەن ژنەکەیەوە، ئەو ژنەی کە هەموو شتێکی پێشکەش کرد تەنها لە پێناو ئەوەی بەختەوەری بکات، بەڵام دەرکەوت ئەم کچە تەنها ئافرەتێکی ناتەواوەو دەیەوێت لەگەڵ چەند کوڕێکدا ڕابوێرێت ئەویش لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە.

ئەم مێردە فەقیرە کەوتە کۆکردنەوەی هەموو ئەو مەلەفاتانە،

راستەخۆ رووی کردە ماڵی باوکی و ئەم هەواڵە ناخۆشەی پێ راگەیاندن، بەڵام ئەوان هەموو ئەو تۆمەتانەیان رەت کردەوەو هەوڵی دا بۆیان روون بکاتەوە کە کچەکەیان ناتەواوەو لە رێ دەرچووە، بەڵام بە هیچ شێوەیەك لە شێوەکان بڕوایان پێ نەکرد لە پاشان رووی کردە ئاسایش پێی راگەیاندن کە چی ئەوانیش لە بەر نەبوونی پسپۆرێك بۆ کەشف کردنی ئەم جۆرە پەیوەندییانە، دیسان بڕوایان پێ نەکرد ناچار بوو پارێزەرێك بگرێت بۆلکۆڵینەوە لە راستی و دروستی ئەم جۆرە پەیوەندییانەو چەسپاندنی، بەڵام لە بەرامبەردا پارێزەرەکەش پێی راگەیاند کە چەسپاندنی ئەم جۆرە بابەتانە سەختە، ئەم داماوە بۆتە بارمتەی دەستی ئەو چەند مەلەفەی بەهۆی ژیانی رۆژ لە دوای رۆژ رووی لە ناخۆشییەو کەسیش بڕوای پێ ناکات.

# ژنێکی سعوودی بە درۆ وفێڵ و ساختە کۆمەڵگای سعوودی دەهەژێنێ

ژنێکی سعوودی تەمەن ٢٩ ساڵ لە شاری دەمام لە رۆژی رەمەزاندا بە پێی وتەیەکی سێ گەنج لەماڵەکەی خۆیدا دەست درێژی سێکسی لێ ئەکەن لە بەر چاوی هەردوو کچەکەی، پاش هەوڵێکی زۆر بۆ خۆ رزگار کردن.

ئەم هەواڵە سەرنجی زۆرێك لە کەناڵەکانی راگەیاندنی بە لای خۆیدا راکێشا، تەنانەت هەواڵەکە گەیشتە وەزارەتی ناخۆی سعوودیاو پارێزگاریش ئەم هەواڵەی پێ گەیشت، بەلام لە دوایدا پاش کۆمەڵێك لێکۆڵینەوە دەرکەت ژنەکە بە حەقیقەت ئەیەوێت ئەو ئایەتی بێنێتە دێ کە خوا ئەفەرمووێت (إن كيدكن عظيم) دەرکەوت تەواوی چیرۆکەکەی هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی دروستکراوی ژنەکەی خۆیەتی هیچ کەس لەم تاوانکارییەدا دەستی نییە.

ژنەکە لە بەردەم لێکۆڵینەوەدا دانی بە راستێکان ناو وتی: من ئەم چیرۆکەم دروست کرد بۆ پارێزگاری کردن لە مێردەکەم و دوور خستنەوەی لە خۆشەویستەکەی کە لە رێگەی هاورێیەتییەوە ناسیوێتی، زۆر ئامۆژگاریم کرد بۆ ئەوەی لێ دوورکەوێتەوە بەلام گوێی لێ نەگرتم، لە بەر چاوی مێردەکەم پێم وت جلەکانی خۆم ئەدڕاندو لە ناو مەتبەخەکە چەقۆم لە خۆم ئەدا خۆم برینداز ئەکرد، هەروەها پێم وت سێ گەنج دەست درێژی سێکسییان لێ کردووم، پاش ئەوەی

هەڕەشەیان لێ کردووم بە تەلەفۆن ئەم قسانەم بۆ ئەوە کرد تەنها بۆ ئەوەی مێردەکەم لەو کچە دوور بخەمەوە کە ناوی (و) بوو .

ژنەکە گوایە گواستراوەتەوە بۆ نەخۆشخانە بۆ ئەوەی پشکنینی پزیشکی بۆ بکرێت پاش ڕووداوی دەست درێژێکە ژنەکە ئەڵێت: نەمزانی درۆکەم بەو خێراییە بڵاوئەبێتەوەو هەموو خەڵکی پێی ئەزانن.

پاش ئەنجامدانی پشکنین دەرکەوت لە ڕاپۆرتەکەی هیچ جۆرێك لە دەست درێژییەکی سێکسی بە دی ناکرێت و هەموو ئەو قسانەی کردوویەتی درۆن و دوورن لە ڕاستییەوە، درۆکانی زۆر بە زەقی دەرکەوت کاتێك ئەو گومان لێکراوانەی دەست گیر کرابوون هیچ کامیانی نەناسی، هەموو ناوەڕۆکی ڕووداوەکە بە درۆ ڕێکخرابوو، ئەویش بەم شێوەیە ناوەڕۆکی ڕووداوەکەی گێڕایەوە: ڕۆژی پێنج شەممە تەلەفۆنێکی نادیارم بۆ هات لە کەسێکەوە داوای لێ کردم بە مێردەکەم بڵێم لەو کچەی کە لەگەڵیدایە دووربکەوێتەوە ئەگینا تۆڵەی لێ ئەکەینەوە، کاتێك مێردەکەی دێتەوە ماڵ تەواوی شتەکانی پێ ڕادەگەێنێت بە پێی قسەکانی گوایە بۆ ڕۆژی دوایی سێ گەنج دەمامك خۆیان بەستبوو هاتنە ژوورەوە لە ژوورەکەیدا لە بەرچاوی هەردوو کچەکەی دەست درێژیان لێ کردووە، کە لە نێوانیاندا برای مێردی ئەو کچەیان لەگەڵ بووە، ئەوانی تریش برای کچەکە بوون . بەم شێوەیە ڕاستێکان دەکەوت و ژنکەش ڕەوانەی دادگا کرا.

# چووکی هاوسێکەی قرتاند کە کاتێك ویستی دەست درێژی لێ بکات

لە یەکێك لە گوندەکانی زەفتی کە بە ٨٥ کیلۆ مەتر دەکەوێتە باکووری شاری قاهیرەوە، ئەم رووداوە رووی دا لە کاتێکدا ژنێك بۆ بەستنی سەرە غازەکەی داوای لە یەکێك لە هاوسێکانی کرد بۆ ئەوەی یارمەتی بدات، کە هاتە ماڵەوەو بینی هەر خۆیەتی و کەس لە ماڵەکەیدا نییە ڕاستەوخۆ دەستی بۆ بردو ویستی دەست درێژی سێکسی لێ بکات، پاش ئەوەی پیاوەکە هەوڵێکی زۆری دا بۆ لاقە کردنی ئەو ژنەی کە داوای یارمەتی لێ کرد بوو، ژنەکە بەرگری لە خۆی کردو ڕاستەوخۆ بە شتێکی تیژ بە ئاڕاستەی جەستەیدا ڕای وەشاند، ئەوە بوو لە ئەنجامدا چووکی پیاوەکەی بە قوڵی ٥سم بریندار کردو ئیدی پیاوەکە نەیتوانی لە سەر پێ ڕابوەستێ و لە هۆش خۆی چوو، ژنەکەش پاش قیژەو هاوارێکی زۆر یەکێك هاوسێیەکی بە هانای گەیشت و ڕەوانەی نەخۆشخانەی کرد، بەڵام دووچاری نەشتەرگەرییەکی توند بووەوەو ئەگەری ئەوەشی لێ ئەکرێت چووکی بە تەواوی لە دەست بدا .

پاش لێکۆڵینەوەیەکی ورد لە سەر چۆنێتی رووداوەکەو ئامادە بوونی ژنەکە لە بەردەم دادگادا هەموو گومانێکی ڕەت کردەوەو کارەکەشی بە بەرگری لێکدایەوە.

خەڵکی گەڕەك و کۆڵان و جادەو بان دەست خۆشیان لەو ژنەکردو بە ژنێکی ئازا ناوزەدیان کرد هەر چەندە هەندێك گومانی ئەویان ئەکەرد پەیوەندییەکی کۆن هەبوو بێت لەگەڵ ئەو پیاوەدا، بەڵام تا ئێستا ڕاستێکان دەرنەکەوتوونەو هەموو لە چاوەڕوانی وتەی پیاوەکەن .

# هاوڕێیەتیەکی ئیلکترۆنی بە لاقە کردنی منداڵێکی یانزە ساڵ کۆتایی دێت

تۆڕەکانی ئینتەرنێت مەودای فراوان بووەو سنوورەکانی بەزاندووە باڵی بەر سەر هەموو کۆمەڵگاکانی جیهاندا کشاوە. جیهان لەبەردەم ئەم تۆڕەدا بچووك بۆتەوە. گەنجێکی هیندی تەمەن ٢٦ ساڵ بە ناوی (س. أ) لە شاری دووبەی لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە لە بەرنامەی چات وقسەکردن کچێکی تەمەن ١١ ساڵ دەناسێت وا خۆ پێ دەناسێنێ کە خۆشی ئەوێت و زۆر کوڕێکی عاتیفییە، شەوانە بۆ چەند کاتژێرێك لە ڕێگەی ڕوومەکانی قسەکردنەوە هەست و سۆزی خۆیان بۆ یەکتر دەگوازنەوە ئەم پەیوەندییە کە ناویان لێ نابوو عاتیفی، یا خۆشەویستی، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ پەرەی دەسەندو پێشدەکەوت.

ئەو کچە منداڵە تەمەن ١١ ساڵە باوکی بەڕێوەبەری کۆمپانیایەو بەیەکەوە لە شاری دووبەی دەژین لە سەرەتادا نەیئەزانی ئەبێت بە نێچیرێك و ڕاوچییەك ڕاوی ئەکات زۆر بە زیرەکی.

لە ڕێگەی قسەکردنی ڕۆژانەیانەوە وادەیەك دادەنێن بۆ یەکتر بینین، چەند جارێك یەکتری دەبینن و بە یەکەوە دەبن ڕۆژێك باوکی کچە دەگەڕێتەو بۆ ماڵ، دەبینێت کەسێك لەگەڵ کچەکەی لە ماڵەوەیە، پرسیار لە کوڕەکە ئەکات و ئەڵێت: تۆ کێت چی دەکەی لێرە؟ بەلام پێش ئەوەی کوڕەکە وەڵام بداتەوە کچەکە دەست ئەکات بە وەلامدانەوەو ئەڵێت: بابە گیان ئەم کوڕە کرێکاری پاککردنەوەی

ئاوەرۆی ناو مەتبەخەکانە! خاوەن بیناکە نادوویەتی!باوکی تا ڕادەیەك بڕوای پێ ئەکات، بەڵام گومانی هەیە لەوەی ڕاست بێ بۆیە دادەبەزێتە قاتی یەکەمو دەپرسێت ئایە ئێوە کەستان ناردووە بۆ سەرەوە بۆ پاککردنەوە ئاوەرۆی مەتبەخەکان؟ ئەوانیش ئەڵێن کەسی وامان نەناردووە، باوکەکە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە پۆلیسەوە ئەکاتو ئەو کوڕە دەست گیر ئەکرێت.

لە لێکۆڵینەوەدا دان بەوەدا دەنێ بۆ چەند جارێك کاری سێکسی لەگەڵ ئەو کچە تەمەن ١١ساڵە کردووە، بۆ چەند شوێنێکیش لەگەڵیدا دەرچووە ژوانیان بە یەکەوە سازکردوە. بەڵی کاکی نەگبەت بۆ چەند ساتێك ئارەزووی سێکسیی خۆی لە زینداندا بینییەوە.

# هەشت کەس دەست درێژی سێکسی دەر حەق بە خزمەتکارێکی فیلیپینی ئەنجامدەدن

رۆژنامەیەکی عەربی ئەوەی بڵاو کردەوە کە هەشت کەس دەست درێژیان کردۆتە سەر کچێکی فیلیپینی رۆژی سێ شەممەی رابردوو، هاوکات رۆژنامەکە ئەوەشی راگەیاند چوار لەو هەو هەشت کەسە توانیویانە دوو کچی فیلیپینی بڕفێنن و بە رەو شوێنێکی نادیار بیانبەن و پاش دوورخستنەوەیان هەر چوار کەسە کە دەست درێژی سێکسی دەرحەق بە یەکێکیان ئەنجام داوە و دواتر چوار کەسی تریش ئاگەدار ئەکەنەوە، ئەوا نیش بەهەمان شێوە کام کارەی خوا پێ ناخۆشە لە گەڵیدا ئەیکەن، بەڵام دەستکاری یەکێکیان ناکەن لەبەرامبەردا ئەوی تر تووشی نەزیف ئەبێت.

شایەنی باسە ئەم تاوانە دوای ئەوە دێت کە هەر دوو کچەکە لە شوێنی کارەکەیان هەڵهاتوون. بۆ ئەم مەبەستەش گەران بەدوای تاوانبارانداا بەردەوامە.

## لە پاکستان تۆڵەسەندنەوەی شەرەف چۆنە؟؟

کاتێك مرۆڤ ناوەرۆکی ئەم رووداوە ئەخوێنێتەوە جگە لە یاسای دارستان هیچی تری نایاتە بەر چاو، ئەم چیرۆکە چیرۆکی بیبی بوو ئەو کچە پاکستانییە تەمەن ١٨ساڵە بوو، کە هەستو دەروونی هەموو جیهانی هەژاند.

بیبی تەمەن هەژدە ساڵەو بە پێی فرمانی دادگایەکی تایبفی لە گوندی میروالای پاکستانی سزای ئەتککردنی بە سەرا سەپێن درا لە تۆڵەی ئەوەی براکەی پەیوەندییەکی هەبووە لەگەڵ ژنێکی ماسوتی کە لە تیرەی گۆجار بەرز تر بووە، هەر بۆیە بە پێی بریاری دادگای تیرەی ماسوتی سزای ئەتککردنی بیبی دەرچوو، بەلاّم بەشێوەیەك پێش ئەنجامدانی ئەتککردنەکە نزیکەی زیاتر لە هەزار کەسیان کۆکردەوە، پاشان کچەکەیان لە سەر شوێنێکی بەرز داناو ئینجا چوار کەس هێرش بۆ کچەکە دەبەن.

شایەد حاڵەکان ئەوەیان راگەیاند لەو کاتەی ئەو چوار پیاوە هێرشیان بۆ کچەکە دەبرد کچەکە هەموو گیانی دەلەرزی لە ترس وشەرمدا، بەلاّم ئەوان بێ رەحمانە جلو بەرگیان دادڕیو لە بەر چاوی خەڵکەکەدا رووتیان کردەوە، بە ئامادە بوونی باوکیشی کە ئەبێت لە ریزی پێشەوە بێت بۆ بینینی تۆڵە سەندنەوەکە، ئیدی وەك ئاژەل هەر چواریان کچەکەیان لاقە کرد، هەر چەندە باوکی کچەکە داوای لێخۆشبوونی لێ کردن، چونکە کوڕەکەی منداڵەو تەمەنی ١١ ساڵە بەلاّم

ئەوان سوور بوون لە سەر تۆڵە سەندنەوەی کچەکەو ئەتککردنی لە بەر چاوی خەڵکی . . . بەڵی خوێنەری خۆشەویست ئەو هۆزە پاکستانییە بەم شێوەیە بە پاساوی پاراستنی شەرەف یا داکۆکی کردن لە مافی ژن کە چی لە بەرامبەردا ژنی تر لە تۆڵەیدا ئەتك ئەکەن، ئەمە چیرۆکی ئەو کچە پاکستانییە بوو کە هیچ تاوانێکی نەکردبوو .

پاکستان هەر چەندە بە ناو حکومەتو دەسەڵاتی تیادایە، بەڵام هیچ ڕەت دانەوەیەکیان نییە سەبارەت بەم جۆرە تاوانانە، ساڵانە دەیان کاری وا لەم جۆرە دووبارە ئەبێتەوەو بە شێوەیەکی ئاشکراش و لەبەر چاوی خەڵکیدا ئەنجام ئەدرێت.

کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە ڕابۆرتەکەیدا داوای لە دەسەڵاتدارانی پاکستانی کرد چیدی کارێك لەم جۆرە دووبارە نەبێتەوەو بەر بەستێك دابنرێت. بەڵام کێ گوێیان لێ ڕانەگرت.

دادگای پاکستانی ڕۆژی یەك شەممە بڕیاری لە سێدارەدانی بۆ شەش تاوانبار دەرکرد بە تۆمەتی ئەوەی دەستیان هەبووە لە پرۆسەی ئەتککردنی کچە پاکستانی بیبی، کە برایەکی لەگەڵ کچێکی ماسوتی پەیوەندی هەبووە لە بەرامبەر ئەو پەیوەندییەدا سزای ئەتککردن بە دەست درێژی لە لایەن چوار کەسەوە دەرحەق بەو کچە ئەنجام درا.

وەکیلی جێگری گشتی تاوانەکان ئەوەی ڕوون کردەوە کە دادوەر لە دادگای نەهێشتنی تیرۆر چوار کەسی ئیدانە کرد بە دەست درێژی سێکسی بۆ سەر بیبی تەمەن ٣٠ساڵ، بەڵام لە ڕاپۆرتەکەی پێشوودا ڕاگەینرا کە تەمەنی ١٨ ساڵە.

هەواڵی دەست درێژی سێکسی بۆ سەر کچە پاکستانی بیبی بوو بە قسەو باسی تەواوی خەڵکی شارو بووە هۆی نانەوەی توورەییەکی

زۆری لە لای دانیشتوانی پاکستان، هەر بۆیە دادگا هەڵسا بە سزادانی تاوانباران لە نیوە شەوی رابردودا.

بیبی داوای لە حکومەتی پاکستانی کرد کە ریوشوێنی ئەمنی بگرێتە بەر بۆ پاراستنی ژیانی بەتایبەتی دوای ئەوەی لە لایەن تاوانبارانەوە چەندین هەڕەشەی ئاراستە کراوە، بە کوشتنی کەس و کاری لە کاتێکدا ئەگەر بێتو دادگا سزای لە سێدارەدانیان بۆ دەربکات هەر وەك بە ئاژانسی روویتەرزی راگەیاندووە.

شایەنی باسە دادگای تاییفی بڕیاری مارە کردنی کچە ماسوتێکەی دەرکرد بە مەبەستی پاراستنی شەرەف و کەرامەتی هۆزەکەیان . (ئێمە مرۆڤین نەك ئاژەڵ)

## کچێکی کوێتی بۆ چەند جارێك براکەی سێکسی لەگەڵ ئەکات (خوایە تۆبە)

ئێمە ئەمرۆ لە سەردەمێکدا ئەژین متمانەی تیادا زۆر کەم بووە، هەر وەك ئەزانین برا هەمیشە پارێزگاری لە دایكو خوشكو زۆر کات خزمیش کردووە، برا هەر وەك بینیومانە یان خوێندوومانەتەوە لە پێناو خوشکەکەیدا زۆر جار خۆی کردووە بە قوربانی، بەڵام ئەوەی لەگەڵ مندا روویدا تەواو جیاوازە، ئومێدەوارم لەگەڵ هیچ کچێکدا روونەدات، زۆر کات خۆزگەی مردنم دەخوازم بەڵام بڕوابوونم بە خوا رێگەی پێ نەدام کارێکی لەو جۆرە بکەم، ئێستا من قوربانی دەستی برای خۆمم ئەو برا تاوانبارەی کە کچێنی پێ لە دەستدام بێ ئەوەی هیچ تاوانێکم هەبێ .

کاتێك ژنێك تیرۆر ئەکرێت یان کچێك لە ناو لانکەکەیدا دەکوژرێت دەڵێن تاوانێکی گەورە روویداوە، بەڵام چی ئەڵێت بە ئاژەڵێك لە سەر شێوەی مرۆڤ هێرشت بۆ بێنێو پەلامارت بداتو جوانترینو پیرۆزترین شتت لێ بسەنێتەوە ئەویش لە دەستدانی پەردەی کچێنییە؟! ئایە دەتوانێت بەم کەسە بڵێت برا یا مرۆڤ؟ بێگومان نا بە تایبەتی لە کاتێکدا کارێکی کردبێ کە سروشت تیادا دێتە لەرزینو دژی هەموو ئایینە ئاسمانێکانو هەموو یاساکانی سەر رووی زەوی بێت لێرەدا عەقڵو لۆژیك ون دەبن مرۆڤ ئەبێت بە ئاژەڵ.

کەس نا برا بەڕاستی دەتوانین بڵێن ئەم سەردەمە سەردەمی

تاوان و شتە سەیرەکانە ئەوە کام ویژدانە خۆی گیل ئەکا و هێرش بۆ خوشکی خۆی ئەبا لە جیاتی ئەوەی پارێزگاری لێ بکات عەتف و خۆشەویستی بە سەردا ببارێنێ، بەلام بەداخەوە ژیانی ئاگر تێ بەردەدا.

پ- سەرەتا نازانم چۆن دەست پێ بکەین لە کوێ وە قسە لە سەر رووداوەکە بکەین؟

و- دەست پێ بکەن لەو شوێنەوەی کە مەبەستانە خۆ تازە من بوومەتە قوربانی دەست درێژی سێکسی کە تیادا پیرۆزترین شتم لە دەست داوە زۆر ئاستەمە برینەکانم سارێژ بێت.

پ- کێ بکەرە لەم رووداوە بە شێوەیەکی تر کێ تاوانبارە؟

و- بکەر وتاوانبار دیارە کە تاوانبارێکی خوێن مژە کە ناوی برامە وەکو نێچیرێك راوی کردم و منی کوت و بەند کرد بۆ هەتا هەتا، نازانم چۆن رزگارم بێت رووداني ئەم کارە لە لایەن کەسێکەوە کە برامە بۆتە کابووسێك کە دەخەوم لە ناو مێشکمدا دێت و ئەڕوات کە هەڵئەستم بەهەمان شێوە خەوەکانم هەمووی خەوی ناخۆشە.

پ- ئەی برا تاوانبارەکەت پێشووتر چی ئەکرد؟

و- پێشووتر هەر لەگەڵمان ئەژیا ئەو فەرمانبەری سەربازییە، بەم دواییە دایکم تێبینی ئەوەی کرد رۆژ لە دوای رۆژ هەڵسوکەوتی ئەگۆڕا و وەك کەسێکی ئاسایی نایەتە بەر چاو هەندێك کات هەر لە خۆیەوە قسەی ئەکرد نەمائەزانی چییەتی، بەلام دوای هەوڵەکانی دایکم گەیشتە ئەوەی کە لەگەڵ هەندێك برادەری خراپدا هەڵسوکەوت ئەکات و مادە هۆشبەرەکان بەکار ئەهێنێ.

-پ کێشەکە چۆن روویدا ئەگەر بکرێت لە سەرەتاوە باسی بکەیت؟

شەوێکیان لە دەرگای ژوورەکەی دام زۆری لێ کردم دەگاکە بکەمەوە منیش دەرگام کردەوە بزانم چی ئەوێت بینیم هەر دوو چاوی سوور بۆتەوە لە ناکاو هاتە ژوورەوەو دەرگاکەی لێ داخستمو دەممی بە شتێك بەست بۆ ئەوەی نەتوانم هاوار بکەم بۆ دایکمو داوای کۆمەکی لێ بکەم، لەبەر ئەوەی خۆشی لاشەیەکی گەورەو زلە نەمتوانی بەرگری بکەم هەر چەندە زۆر هەوڵم دا بەلاّم بێ سوود بوو.

لەو شەوەدا بەدەستی بووم بە قوربانی توانی ئەوەی بییەوێت بیکات بەهاری عومرم ئاگر تێبەردا، سەرەرای ئەوەش هەرەشەی لێ کردم بەچەقۆ ئەگەر بێتو دەنگم بەرزکەمەوە، خەریك بوو ئەمردم، خۆزگەم ئەخواست لەو شەوەدا بمردمایە نەك براکەم بەم شێوەیە بدیتایەو دەست درێژیم لێ بکات .

پ- تۆ چیت کرد دوای ئەوەی دەست درێژی لێ کردی ؟

و- چاوەرێم کرد هەتا بەیانی. . . بە دایکم نەوت نەمدەتوانی پێی بڵێم لە بەر ئەوەی هەرەشەی لێ کردم، هەوەها لەوەش ترسام دایکم بڕوام پێ نەکات، بۆیە بێ دەنگیم هەڵبژارد هەموو ئەوەی روویدا لە دڵمدا دەرم نەکرد، تەنانەت یەك وشەش سەبارەت بەو رووداوە لە دەمم نەهاتە دەرەوە.

پ- براکەت تەمەنی چەندە؟

و- ئەو لە من گەورەترە تەمەنی ۲۷ ساڵە ژنیشی نەهێناوە.

پ- ئایە براکەت لەو کەسانەیی رابردووی هەبێ؟

و- هەر وەکو بزانم هەڵسوکەوتی زۆر باش بوو، بەلاّم بەم دواییە خراپ بوو، بەتایبەتی دوای ئەوەی هاوڕێیەتی کۆمەڵێك برادەری خراپی ئەکرد کە مادەی هۆش بەریان بەکار ئەهێنا، هەر بۆیە لە ناکاو

تێکچوو وەك کەسێکی نەخۆش دەهاتە بەر چاوو تووڕە دیار بوو، هەمیشە زۆر بە کەمی لەماڵەوە دەمانبینی شەوان زۆر درەنگ ئەهاتەوە بۆ ماڵ.

پ- هیچ ئامۆژگاریتان ئەکرد بۆ ئەوەی لەم ڕێگەیە دوور بکەوێتەوە؟

و- باوکم کۆچی کردووە داکیشم نەیدەتوانی سنوورێك بۆ هەڵسوکەوتەکانی دابنێ بەو بۆنەیەوە ئەو لە هەموو براکانی ترم گەورەترە.

پ- هیچ هەوڵی دایەوەجارێکی تر دەست درێژی بکاتەوە؟

و- بەراستی بۆ چەند جارێك هەمان کاری لەگەڵم دووبارە ئەکردەوەو هەڕەشەی لێ ئەکردم بە چەقۆ کە ناو گیرفانیدا هەڵی دەگرت منیش لە ترسان نەمدەتوانی بە دایکم بڵێم لە هەمان کاتیشدا دەترسام سك پڕ بم لێی، ئەوکات دەرئەنجامەکەی زۆر خراپتر دەبوو. بەڵام بەم دواییە بە دایکم ڕاگیاند هەموو دەست درێژێکەم بۆ گێرایەوە ئەویش تەواو تێکچوو بە بیستنی ئەم کارە بۆیە وتی هەرگیز نابێ بێ دەنگ بین لە بەرامبەر ئەم تاوانبارەدا.

پ- هیچ لایەنی پەیوەندیکارتان ئاگەدار نەکردەوە؟ هیچ سکاڵایەکتان تۆمار نەکرد؟

و- ئێمە بڕیاری ئەوەمان دابوو بەڵام دەست گیر کرا ئێستا لە زیندانە، لەگەڵ کۆمەڵێك ڕەفیقی تاوانباری تری کە بەیەکەوە مادە هۆش بەرەکانیان بەکار ئەهێنا ئێستا ئەو لە زیندانی مەرکەزییە.

پ- چی دەکەی باشە پاش ئەو دەست درێژییانە؟

و- من هیچ هەڵەم نەکردووەو بەڵکو ستەمم دەرحەق کراوە، هیوام دارم شوو بکەم و وەك کچانی ئەم جیلەی خۆم بژیم بەڵام ئەوەی ڕوویدا

لەو خەونە مەحروومم ئەکات و هەر کەسێکیش بێتە داوام ئەگەر ڕازی بێت بە حاڵی من منیش قەبووڵی ئەکەم زەواجی لەگەڵ بکەم لە سەر سوونەتی خواو پێغەمبەر.

پ- دوا وتەی کۆتایی یا شتێکت ماوە بیڵێت؟

و- هەر ئەوەندە دەڵێم ئێمە لە سەر دەمێکدا دەژین متمانەی تیادا نەماوە ئەمن و ئاسایش زۆر کەم بووە، من قوربانی دەستی برای خۆمم کە بوو بە درندەیەك بۆ گیانم هێرشی بۆ بردم وەرزی بەهاری عمومری لە ئاگر بەرداو منی گیرۆدەی دەستی ئایندەیەکی نادیار کرد، جار وا هەیە بیر لەوە ئەکەمەوە دەڵێم تۆ بڵێت برا بێت قەت بڕوا ناکەم برا بێت لێرەوە داوا لە هەموو کچانی کوێت ئەکەم بە هیچ شێوەیەك متمانە بەو برایانەیان نەکەن کە مادەی هۆش بەر بەکار ئەهێنانن، چونکە ئەوانە هیچ بەرنامەو مەبدئێك نییە لە ژیانیاندا هەر بۆیە ئاگاداریان ئەکەمەوە، چونکە من قوربانی دەستی ئەو جۆرە کەسانەم.

## گەنجێکی هیندی نەنکی خۆی دەخوازێت

بانشبارا ( هند) گەنجێکی هیندی تەمەن ٢٥ ساڵ بە ناوی نارایان بیسواس نەنکی خۆی دەخوازێتو دەیکاتە هاوسەری خۆی، بەمەبەستی ئەوەی زیاتر بتوانێت بایەخی پێ بداتو بەخێوی بکات بە شێوەیەکی جوانتر، شایەنی باسە نەنکی تەمەنی ٨٠ ساڵەو مێردەکەی پێش ٣٠ ساڵ لەمەوبەر کۆچی کردووە، گەنجەکە لە وەڵامدانەوەی پرسیارێکی ئاژانسی رویتەز وتی: هەستم کرد نەنکم پێویستی بە چاودێرییەکی زیاتر هەیە، لە بەر ئەوە بە ساڵا چووە بۆیە وام بەباش زانی بیخوازم تا بتوانم باشتر خزمەتی بکەم.

ئاژەنسی روێتەرز ئەوەشی راگەیاند گەنجەکە دەرچووی دواناوەندییەو وانەی تایبەتیش ئەڵێتەوەو کاتەکانی تریش وەك جوتیارێك لە پەرێزی برنج کار ئەکات.

نەنکە پشت چەماوەکەی ئەڵێت: من زۆر خۆشحاڵم ئەمرۆ کە بۆ دووەم جار شوو ئەکەمەوە بە تایبەتی بە شێوەو دابو نەریتی هیندۆسی. مەراسیمی هاوسەرگیریەکە لە گوندی بانشبارا کە ١٥٠کیلۆمەتر دەکەوێتە خۆر ئاوایی گاڵکتا بەرێوە چوو.

نەنکی ئەم گەنجە کە ئێستا هاوسەریەتی ئەڵێت: خۆم بە دەستی خۆم بە خێوم کردووە ئەویش ئێستا بە شێوەیەکی جوان چاودێریم ئەکاتو خواردن ئەکاتە دەمەوەو لە کاتێکدا ئەو قسەی ئەکرد هاوسەرەکەی وتی: خاڵێکی سووریشم لە نێو چەوانی کردووە کە

ئاماژەیە بۆ ئەوەی ژنێکی هیندۆسییە کە هاوسەر گیری ئەنجامدابی.

پەرپرسانی ولات ئەوەشیان راگەیاند سەبارەت بەم کردارە کە ئایینی هیندۆسی زەواجی لە مەحرەم حەرام کردووە، بەلام سەبارەت بەم بابەتە هیچ بڕیارێکی یاسایی ئەوتۆیان دەر نەکرد.

دیلیب داس بەرپرسێکی حکومییە بە ئاژانسی روێتەرزی راگەیان کەس تا ئێستا لە خێزانەکەی سکالای لە دژیان تۆمار نەکردووە، هەر بۆیە خێزانەکەشی بەم کارە ڕازی بوونەوە کەس تا ئێستا ناڕزاییی خۆی رانەگەیاندووە.

# ژنێکی تورکی لە ناوەندی ئیستانبول دەکوژرێت بە پاساوی پاراستنی شەرەف

ژنێکی تورکی دەکەوێتە بەر هێرشی براکانی لە سەر شەقامێکی سەرەکی لە ناوەندی ئیستانبول تۆمەتی ئەنجامدانی کرداری زیناو نانەوەی منداڵێك لە دەرەوەی چوارچێوەیەی خێزانی، ئەوە بوو لە ئەنجامدا گولەیەك لە قاچی دەکەوێت براکانی ڕاستەوخۆ بە جێی ئەهێڵن وادەزانن ئیدی تەواو مردووە.

تیمەکانی فریاکەوتن بە خێرایی"گوڵ دونیا" دەگەیەننە نەخۆشخانە بۆ چارەسەرکردنی، گوڵ دونیا کە تەمەنی ٢٢ساڵە داوای لە پیاوانی ئاسایش کرد ڕێوشوێنی ئەمنی بگرنە بەر، چونکە براکانی وازی لێناهێنن، ئەوە بوو هەمان شەوی بریندارکردنی براکانی کە تەمەنیان ٢٠و٢٤ساڵە بەشێوەیەکی نهێنی دەچنە ناو نەخۆشخانەکەوەو یەکێك لە براکانی دوو گولە لە سەری دەداتو ڕادەکەن بەرێوەبەری نەخۆشخانەش کوشتنی گوڵ دونیای ڕاگەیاند.

گوڵ دونیا لە دێیەکی بچووك لە پارێزگای بەتلیس کە دەکەوێتە باشووری خۆرهەلاتی وەلاتەوە لە خێزانێکی کەم دەرامەتو فەقیر چاوی بە ژیان هەڵهێناوە، دوو مانگ بەر لە کوشتنی منداڵێکی ئەبێت لە ئەنجامی پەیوەندییەکی سێکسی لەگەڵ مێردی کچی مامی، پاش ڕووداوەکە باوکی داوای لێ کرد مارەی بکات بیکات بە ژنی دووەمی، بەڵام ئەوە بوو ئەم بابەتەی ڕەت کردەوە، لە بەرامبەردا باوکی ڕەوانەی

شاری ئیستانبوڵی ئەکات بۆ ئەوەی منداڵەکەی لەوێ دابنێت.

بەڵام لە پاشان خێزانەی بڕیاری کوشتنی بۆ دەرئەکەن، ئەم رووداوە بووە باسی زۆرێك لە کەناڵەکانی ناخۆیی و جیهانی بەتایبەتی تورکیا کە زۆربەی موسوڵمانە.

# باوکێکی ئیسرائیلی دەست درێژی سێکسی ئەکاتە سەر کچەکەی

زۆرێک لە مانشێتو بابەتە زەقەکانی نێو مەڵپەرو سایتەکان ناونیشانی ئەم بابەتەیان لە خۆ گرتبوو، چونکە بە راستی ڕووداوێکی لەم جۆرە نامۆیە بە مرۆڤایەتی، هەموو دابو نەریتێکی کۆمەڵایەتی ئەم جۆرە کردارە ڕەت ئەکاتەوە، هەر چەندە بۆ کۆمەڵگایەک وەك کۆمەڵگای سەهیۆنی نامۆ نییە، بەتایبەتی دوای تێکچوونی شیرازەی خێزانی لە لای یەهود، هەر وەك ڕۆژنامەی "یەدیەعوت ئەحرونوت" باس لەوە ئەکات.

ڕووداوەکە بە ناونیشانێکی زەق لە سەر ڕۆژنامەی مەعاریف بڵاو بۆوە، کە باوکێکی یەهودی هەڵساوە بە ئەنجامدانی سێکس لەگەڵ هەردوو کچە تەمەن ٨ساڵو ٢٠ ساڵەکەی بە پاساوی ئەوەی دایکیان بە ئەرکی ژن ومێردایەتی هەڵنەساوەو مافی مێردەکەی لەو ڕووەوە نەداوە.

باوکەکە کە تەمەنی ٤٧ ساڵە نەیویست ناسنامەو ناوی خۆی بڵێت لە کاتی لێکۆڵینەوەدا، کە پۆلیسی شاری نەتنانیای کەنار دەریا لەگەڵی ئەنجامی دا بوو، وتی: هاوسەرەکەم ڕاوەستا بوو لە دانی مافی هاوسەریم بۆیە منیش هەڵسام بە ئەنجامدانی سێکس لەگەڵ کچەکانم بۆ تێر کردنی ئارەزووم، هەروەها دانی بەوەشدانا بۆ ماوەیەکی زۆرە ئەو بەم کردارە هەڵدەستێت، بەتایبەتی لەو کاتەوەی کچە گەورەکەی

تەمەن ٩ ساڵ بووە ئەو ئەم کارەیان لەگەڵ ئەنجام ئەدات، نەیتوانیوە واز لە ژنکەشی بێنێ لە بەر چەند پەیوەستبوونێك کە شەریعەتی یەهودی داینـاوە بۆ ژن ومێرد، نەیتوانیوە ژنێکی تر بهێنێتەوە هەر چەندە هەندێك مەزهەبی تر لە شەریعەتی یەهودی ڕێگە بە هێنانەوەی ژنی دووەم ئەدەن.

شایەنی باسە خێزانەکەی دانی بەم تاوانەدا نا لە بەر دەم پۆلیسی شارەکە، لەبەرامبەر ئەم کارە دادگای ئاشتی لە شارەکەیدا بڕیاری زینـدانی بۆ دەرکرت بۆ ماوەیەکی کاتی تا ئەو کاتی بە شێوەیەکی کۆتایی بڕیاری لە دادگاوە بۆ دەئەکات .

سەرچاوە یاساییە ئیسرائیلیەکان باس لەوە ئەکەن حوکمەکەی ٧ ساڵ زینـدانی کەمتر نابێ هاوکات هاوسەرەکەی وهەردوو کچەکەی داوای لە سێدارەیان بۆ داوا کرد.

# کۆتایەکی پڕ تراژیدیا لە چیرۆکێکی خۆشەویستیدا

چیرۆکی حەسەن و ئەشفین وەك چیرۆکەکەی رۆمیوو جولێتی شکسبیر دیتە بەر چاو، حەسەن و ئەشفین لە دێیەکی بچووك لە ناوەندی پاکستان دەژیان قەدەری ژیان وا بوو لە هەمان زانکۆدا بخوێنن رۆژ لە دوای رۆژ خۆشەویستی لە نێوانیاندا دروست بوو، بەڵام بەخت یاوەریان نەبوو، لە دوو لق و تیرەی جیاواز بوون چیرۆکی خۆشەویستیەکەیان بە تراژیدیا کۆتایی پێهات.

باوکی ئەشفین دوای ئەوەی لە لایەن پۆلیسەوە دەست گیر کرا دەگریا لەسەر ئەوەی کچەکەی کە تەمەنی ٢٣ساڵە بە ئاسن خنکاندوویەتی، وتی کۆمەڵێك حەبی خەوتنم دەرخوارددا لە ناو چا، پاشان خنکاندم قوربان چی بکەم ئەگەر هاتوو شەرەفم رۆیشت ئیتر وا دەزانم هیچم نەماوە، تا ئێستا هاوارەکانی بە گوێمدا دەزرینگێتەوە لە ناو هەموو کچەکانم ئەوم زۆر خۆشنەویست، ئەمەوێت هەر دوو دەستم ببڕمەوەو کۆتایی بە ژیانم بێنم .

ساڵانە سەدان ژن لە پاکستان دەبنە قوربانی دەستی باوك وبراو پیاو، بە مەبەستی بەرگری کردن لە شەرەف و نامووس و داب ونەریتی کۆمەڵایەتی، کە باڵی بە سەر کۆمەڵگادا ڕاکشاوە، بەتایبەتی لە شارو شارۆچکەکانی پاکستان.

زۆرکات دەسەڵات و دەزگاکانی پۆلیس ناتوانن دەست تێوەردەن لەم جۆرە رووداوانە، بەتایبەتی ئەگەر هاتوو کێشەی شەرەف ونامووس و

ئەوبابەتانە بوون.

رۆژنامە نووسان ئەم بابەتەیان زۆر بە زەقی لە کۆڤارو رۆژنامەکاندا بلاّوکردەوە، لە کاتێکدا بووە تاقیکردنەوەیەك بۆ سەرۆك مووشەرەف بۆ دانی بەربەستێك لە بەردەم ئەم جۆرە کارانە، بەلاّم مووشەرەف رووبەرووی کۆمەڵێك ڕەخنە بووەوە بەوەی تا ئێستا نەیتوانیوە یاسایەك دەربکات بۆ بنەبڕکردنی ئەم دیاردەیە لە ناوکۆمەڵگای پاکستانیدا، بەتایبەتی دیاردەی توندوتیژی وکوشتن وبرین تاوان کردن بە پاساوی بەرگری کردن لە شەرەف وناموس .

لەم چیرۆکەدا ئەشفین بوو بە قوربانی دەستی داب و نەریتی کۆمەڵگاکەی هەر چەندە ئەندامانی خێزانەکەی کەسانی خوێندەوارو مەدەنین و ئەندازیارن، بەلاّم تازە دەستیان سوور بوو بە خوێنی کچەکەیان.

خەڵکی کەرەك و ناوشار باس لە کێشەیەکی سیاسی ئەکەن کە لە ناو هەر دوو خێزاندا هەبووە، بەلاّم کاتێك ئەشفین زانکۆی تەواو کرد ماڵەوە بەخێرایی لە یەکێك لە کوڕە مامەکانی مارەیان کرد، پاش هەفتەیەك لە پرۆسەکە کۆمەڵێك فشار خستنە سەر وای لە ئەشفین کرد هەڵبێت و ماڵەوە بە جێ بهێڵێت، لەگەڵ حەسەندا بەرەو شوێنێکی نادیار برۆن.

بەلاّم دواتر خێزانەکەی توانییان جێگاکەیان بدۆزنەوە، ئەشفین پاش سێ رۆژ کوژرا، حەسەنیش هەلاّت لە تەلەفۆندا پێی وتن خێزانەکەیم سوێند داوە بە قورئان ئەزێتی نەدەن ئەگەر لەگەڵتان گەرایەوە، بەلاّم ئەوان خاوەن قسەی خۆیان نەبوون، لە کۆتایشدا ئەشفین ژیانی بە چیرۆکێکی تراژیدی کۆتایی پێ هات.

# پیاوێکی میسری جوانی ژنەکەی بەکار دێنێت بۆ کاری ساختەوە دزی

پیـاوێکی میـسری لـە هـەموو بـەها جوانـەکانی مرۆڤایـەتی خـۆی داماڵانـد، تـا ئـەو ئاسـتەی ژنەکـەی خـۆی بـەکار بهێنێـت بـۆ کـاری ساخاختەو دزی لە هاوسێکانی خۆی. هـەر چەندە ئەم پیاوە بەدەست نەداری ونەبوونییەوە دەینالاند، بەڵام نەدەبوو ژنەکەی بەکار بهێنێت بۆ ئیغراکردنی مەحمودی هاوسێی. مەحمود کابرایەکی نەخشە ساز بوو، لە نزیك ماڵی هاوسێکەی کاری ئەکرد، رۆژێك ناسری هاوسـێی بانگی کرد بۆ ئەوەی لە ماڵەکەی چەند نەخش ونیگارێك بکات لە سەر دیواری ژوورەکەی، مەحمود کاتێك کەرەستەکانی لەگەڵ خۆی هێنا بۆ ماڵەوە خەریك بوو دەستی بە نەخش ئەکرد، بەڵام ناسر داوای لێ خواست هاتە دەرەوە بچێت چەند ساردییەك لەگەڵ خۆی بێنێتەوە، کاتێك ناسر چووە دەرەوە ژنەکەی ناسر هاتە بەردەم مەحمودو رۆبەکەی بەری داکەندو خۆی رووت کردەوە مەحمود لە شەرمدا نەیئەزانی چی بکات لەو کاتەدا ناسر خۆی کردە ژوورەوە وەك پیاوێکی جوامێر وئازا کەوتە جوێنـدان و قسەکردن بـە مـەحمودی نەخـشە سـاز، مـەحمود سەرسـام مابوو دەستەو ئەژنۆ نەیدەزانی چی بکات، لێرەدا ناسر مەحمودی بەوە تاوانبار کردووە کە ویستوویەتی دەست درێژی لە هاوسەرەکەی بکات هـەر بۆیـە داوای لێ کـرد بـڕی ٣هـەزار جنێهـی میـسری بـداتێ، ئـەگینا خێزانەکـەی لـێ ئاگـادار ئەکاتـەوەو حـەیای ئـەبات، مـەحمود لـە ژێـر

هەڕەشەی ناسر ناچار بوو ئیمزا لەسەر ۲۰۰جنێهی میسری بکات ئەوەی لە ناو گیرفانیشی بوو بیانداتیٚ پاش ئەوەی ناسر لە دەستیان ڕزگاری بوو، ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە پۆلیسەوە کرد، پاش دەست گیرکردنی ناسرو ژنەکەی لێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کراو ڕەوانەی دادگا کران. دادگای تاوانەکان سزای ۲ ساڵ زیندانی بەسەریاندا سەپاند.

## هاوسەرەکەی پێی وت دووگیانم ئەویش بێ ڕەحمانە کوشتی

سێ مانگ بەسەر پرۆسەی هاوسەرگیریەکەیاندا تێپەر بوو بوو، هاوسەرەکەی پێی راگەیاند کە دووگیانە، وای زانی کە ئەم هەواڵەی پێ رابگەیێنێت ئەوا پەیوەندی هاوسەرگیریان بە هێز تر ئەبێت، چونکە مێردەکەی لە ژنی یەکەمی بێ هیوا بوو منداڵی ببێت بۆیە ئەگەر گوێ بیستی ئەم هەواڵە ببێت ئەوا زۆر پێی خۆش ئەبێ، بەلأم کاتێك ئەم هەواڵەی بە مێردەکەی راگەیاند ڕاستەوخۆ مێردەکەی تووڕە بوو وتی هەرگیز شتی وانابێ ئەمە خیانەتە.

چونکە ئەو ئەزموونی لەگەڵ ژنی یەکەمدا هەیە کە منداڵی نابێت لەبەرامبەر ئەم هەواڵە کە ژنەکەی لە بەر زیاد بوونی خۆشەویستی پێی راگەیاند بوو، مێردەکەی هەڵسا بە خنکاندنی ژنەکەی، ئێمە سەردانی تاوانبارمان کردو لەگەڵ هەندێك لە کەس و کاری ژنەکەی و دکتۆری نەخۆشیەکانی ئافرەتان دانیشتین، ئەوەی کە بووە مایەی ئاخ وداخ ئەوە بوو کە پیاوەکەی بە پێی راپۆرتی پزیشکی هیچ هۆکارێکی جەستەیی نییە بۆ ئەوەی منداڵی نەبێت، بەلأم تازە کەسێك لەم نێوانەدا بووە قوربانی.

گومانە دوور لە راستیەکانی دووچاری ئەم دەرئەنجامەی کردو ژیانی خۆی بە دەستی خۆی ئاگر تێبەردا، چونکە بەراستی ژنەکەی ویستی دڵی خۆش بکات نەك کۆتایی ژیانیان بەم شێوەیە کۆتایی پێ بێت.

# پیاوێکی لوبنانی ژنەکەی وکچەکەی دەکوژێ بە پاساوی پاراستن لە شەرەف

دوایی ئەوەی لە ئەڵمانیاوە دەگەڕێنەوە، لە بەیروت لە پایتەختی لوبنان نیشتەجێ دەبن، ئەویش لە ناوچەی مەریجە کە دەکەوێتەوە باشووری پایتەختەوە، ئەم هەواڵە بەیروتی هەژاند، ئەو پیاوە زۆر بە بێ ڕەحمانەو وەك ئەوەی ئەو کاتەی لە پێستی مرۆڤەوە دەرچوو بێتو بوبێتە ئاژەڵ، لە ئەنجامدانی ئەم تاوانەدا نەدەستی لەرزی ونەچاوی تروکاند ئای کە چەندە دڵ ڕەق بووە.

سەرەتا کێشەیان کۆمەڵێك کێشەی تایبەت بووە، بەلاّم لە دوایدا دەرکەوت ئەو هۆکارەی وای لەم پیاوە کردووە دەستی سوور بێ بە خوێنی هاوسەرەکەیو کچەکەی، تەنها بە دافیعی شەرەف بووە، هیچی تر نەبووە، هەر چەندە لێرەو لەوێ قسەو باس زیاتر لەسەر ئەم ڕووداوە دەکرا .

بۆ زیاتر ئاشنا بوون بە وردەکارییەکانی ڕووداوەکەو چۆنێتی ڕوودانی هەوڵماندا لە ڕێگەی هاوسێکانیەوە هەندێك زانیاری راستمان دەست کەوێت، لە سەر ڕووداوەکە. هەڵساینو چووینە گەڕەکی مەریجە ئەو گەڕەکەی تا ئێستاش ئاسەواری جەنگی پێوە دیارە، کۆمەڵێك خانووی کۆن وبێ خزمەت لە یەکێك لەو شوقانە لە بلۆکی دووەم دوو کەس خوێنیان تك تك بە دیوارەکانەوە هاتە خوار، کە دەچیتە ئەو ژوورە هەست بەو قیژەو هاوارو گریانانە دەکەی کە لە دوا ساتی ژیانی

ئەمماڵەدا بووە، لە دەرگای یەکێك لە هاوسێکانماندا بۆ زانیاری زیاتر بەیانی بوو دوو ئافرەت هاتنە بەردەگاو فرمێسك بە چاوەکانیاندا دەهاتە خوار، ئاهو حەسرەتیان بۆ ژیانی ئەو خێزانە هەڵدەکێشا، چونکە تەواوی ئەو خێزانە بوون بە قوربانی هەندێکیان ڕەوانەی گۆڕ کران ئەوانی تر ڕەوانەی زیندان کران .

پرسیارمان کرد لەسەر کچە تەمەن ١٧ ساڵەکەی گوایە لاقە کرابێت و کچێنی لە دەست دابێ، یەکێك لە هاوسێکان بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: ئەم کچە پێش چەند ساڵێك لە ئەڵمانیا لاقە کراوە ئەو کاتی لەگەڵ خێزانەکەی دەژیا، بەلاّم ئەم کچە بوو بە قوربانی دەستی ئەو لاقەکردنە ئەویش بە پێی راپۆرتی یەکێك لە نەخۆشخانەکانی ئەڵمانیا کە تیادا هاتووە تووشی دەست درێژی سێکسی بۆتەوە .

یەکێك لە هاوسێکانی تر وتی: ئەم خێزانە پێش ٩ مانگ لەمەوبەر لە ئەڵمانیاوە هاتنەوە بەیروت پاش ١٣ ساڵ مانەوە لە غووربەت پیاوەکە مرۆڤێکی چاك بوو هاوسەرەکەی زۆر بەرێز بوو، هەر دوو کوڕەکەی لە سوپا خزمەت ئەکەن، تەمەنیان ٢٠ ساڵە بەلاّم مەتەڵی ئەم کچە زۆر سەیرە، چونکە ئەو لە ژێر مانەوەی بە زۆر بوو لە ماڵەوە بۆ ئەوەی هەمیشە لە ماڵەوە بمێنێتەوە بەبەردەوام کۆمەڵێك حەبی هێور کەرەوەی دەرخوارد دەدرا، هاوسێکەیان ئاهێکی هەڵکێشاو وتی: زۆر بەداخەوە خێزانێکی بێ کار بوون براکەی پارەی بۆ خەرج ئەکردن، سەیارەیەکی کرێی کڕی بوو بۆ ئەوەی ئیشی پێ بکات، بەلاّم لە دوایدا فرۆشتیەوە دیارە بۆ ئەوەی بووە کلاّشینکۆفێکی پێ بکڕێت و ئەم کارەی پێ ئەنجام بدا.

ئێمە بە یەکێك لە هاوسێیەکمان وت مێردی ژنەکە لە لێۆڵینەوەدا

دانی بەوە داناوە ئەو ژنەکەی‌و کچەکەی بۆیە کوشتووە، چونکە داوای پارەیان لێ ئەکرد بۆیە ئەویش بەم کارە هەڵساوە هاوسێکەیان خۆی پێ رانەگیراو وتی: درۆ ئەکات وانییە خێزانەکەی دەیویست بچێت بۆ نەخۆشخانە بۆ ئەنجامدانی پشکنین، بەلاّم ئەو هیچ پارەی پێنەدان کچەکەشی هەر لەماڵەوە حەپس کرا بوو، بەبەردەوام دەرزی خەوتنیان لێ ئەدا.

بەلاّم یەکێك لە هاوسێکانی تر بێ ترسانە وتی: ئەم خێزانە هەمیشە لە ناکۆکی بەردەوامدا بوون مێردەکەی لە خۆی‌و منداڵەکانی ئەداو ئەو کچەی کە لە ماڵەوەش هەمیشە حەپس کرابوو، جارێك توانی خۆی دەرباز بکات خۆی بگەیێنێتە باڵوێزخانەی ئەڵمانیا لە شارەکەی، بەلاّم باوکی هەر بە زۆر گەڕاندیەوە.

شەوی رووداوەکە هاوسێکەیان کچەکەی بینی لە ماڵەوە دەرچوو نەگەرایەوە، یان گەراوەتەوە لە کاتێکی زوو لە بەر ئەوەی رووداوەکە بەیانی دوایی روویدا.

هەروەها وتی: نزیك سەعات حەوت ونیو گوێم لە دەنگی دەمانچە بوو لەو ماڵەوە تەقە دەکرا، دواتر بینیم باوکەکەیان زۆر بە پەشۆکاوی لە ماڵەوە هاتە دەرەوە دەیوت: دە هەزار دۆلاری شاردبۆوە ویستوبوی لەگەڵ براکەی بچن بۆ باڵویزخانەی ئەڵمانیا، ژنەکەی داوای تەلاّقی لێ کرد بوو، هەروەها لوبنانیش بە جێ بهێڵێت دیارە بۆ ئەوەی بووە ئەو ولاّتە بە جێ بهێڵێت.

بەم شێوەیە دەستی سوور بوو بە خوێنی ژنەکەی‌و کچە تەمەن ١٧ ساڵەکەی، سەرەتا بە ژنەکەیەوە دەستی بە کوشتن کردو چەند گولەیەکی پێوە نابوو، پاشان بە ساردییەکەوە بەرەو کچەکەی چوو بوو

کچەکەی بە بێ ئەوەی هاوار بکات لە بەر ئەوەی ئەو خەوتبوو بە هێزی حەبو دەرزی هەمیشە دەیخەواند هەر بۆیە دوای ئەوەی دڕندەیی و ڕقی خۆی بە ژنەکەی دەرکرد ئینجا رووی کردە کچە خەتووەکەی داخی دڵی بەویش رشت. ئەم تاوانە نموونەی دەیان و سەدان تاوانی ترە کە لە بەیروت رووئەدات، زۆر بەدڕندانەیی نەك هەر ئەوەندە بەڵکو لە تەشەنەکردنیشدایە رۆژانە زیاد ئەکات. پرسیارەکە ئەوەیە بۆ؟ ئەم پرسیارە گەورەیە بەقەد قەبارەی حەبلی لە سێدارەدان.

## لاقە کردن ورفاندنی بووکێك لە سەر ڕێگایەکی گشتی

تاوانێکی لەم جۆرە ناخی هەموو خەڵکی هەژاند، بووکێکی گەنج چەند هەفتەیەك بەسەر زەواجەکەیدا تێپەر بوو بوو، لە نوێژی نیوەڕۆدا لەبەردەم چاوی خەڵکی لە سەر شەقامێکی گشتی تاوانێکی لەم جۆرەی دەرحەق کرا، هەرچەند هەوڵی خۆ ڕزگار کردنی دا، بەلاّم بێ سوود بوو. ئەم ژنە بێ تاوانە بەم شێوەیە چۆنێتی ڕووداوەکە دەگێڕێتەوە: ئێوارەی رابردوو لە ماڵی خاڵۆم دەهاتمەوە سەعات پێنج بوو دوای ئەوەی سەردانی ماڵی خاڵم کرد لە لادێکە هاتمەوە، تێبینیم کرد دوو کەس لەگەڵم سەر کەوتن و هەوڵیان ئەدا قسەم لەگەڵ کەن، کە کاتێك دابەزیمە خوارەوە بینیم هەر دوام کەوتوون ئیدی منیش هەنگاوەکانم زیاد کردو بەخێرایی ڕێم ئەکرد، کەچی ئەوان هەر دوام ئەکەوتن، منیش ڕاوەستام بانگی زەلامێکم کرد کە بە تەنیشتمدا دەڕۆیشت تا ڕزگارم بکات لە توانج و قسەکردنی ئەو دوو گەنجە، بەلاّم هیچ ئاوڕی لێنەدامەوە، منیش ناچار بووم لە ڕۆیشتن بەردەوام بم، بەلاّم لە ناکاو هەر دوو گەنجەکە بانگی عەرەبانچییەکیان کرد، حەنتور؟ هەر دووکیان سەرکەوتن وبە تەنیشتمدا دەڕۆیشتن، بەلاّم من دوور کەوتمەوە لێیان تا لە دەستیان ڕزگارم بێت، بەلاّم بێ سوود بوو، تا لە ناو بازاڕ نزیك کەوتمەوە لە بینای ئەنجوومەنی شاری زەفتی کە چی بینیم عەرەبانچێکە راوەستاو هەر دوو گەنجە هاتنە خوارەوە کۆمەڵێك شتی تیژیان لەگەڵ خۆ هەڵگرتبوو، ویستیان دەستم لێ بوەشێنن و جلەکانم

بدڕێنن منیش کەوتمە هاوار کردن، هەتا من هاوارم کرد دەستمیان بە چەقۆ بریندار کردو کەوتنە سەرم بە لێدان و ئیهانەکردن، بەراستی کە بە بۆکس لە سەریان دام کۆنترۆڵی خۆم لە دەستدا کەوتمە سەر ئەرز منیان نایە ناو عەرەبانەکە بە هەموو هێزم هاوارم ئەکرد بەڵام کەس بە هانام نەهات خەڵکی هەموو بەوێدا ڕەت دەبوون، زۆر داوام لەو دوو تاوانبارە کرد وازم لێ بێنن، بەڵام زۆر کەلە ڕەق بوون وازیان لێ نەهێنام، لە تاوانەکەی خۆیان بەردەوام بوون. پێئەکەنین دەیانوت خەمت نەبێ دوای هەر چی ئاڵتوونت پێوەیە لێتی دەسەنین، بەڵام پەلە مەکە منیش هاوارم ئەکرد بە هەموو هێزم هاوارم ئەکرد کەس لەوانەی کە بەوێدا تێپەڕ دەبوون کەس بەدەنگمەوە نەهات، ئەترسام زۆر لەوە ئەترسام لاقەم بکەن وشەرەفم بشێوێنن و لە هەمان کاتیشدا دەستم خوێنی لێدەهات و ئازارێکی زۆری هەبوو، خەڵکی هەموو سەیریان ئەکردو کەسێکیش دەنگی نەئەکرد، وەك ئەوەی سەیری فیلمێکی سینەمایی بکەن. زۆر هەوڵم دا وایان پیشان بدەم کە عوزرێکی شەرعیم هەیە تا بۆ ئەوەی لە کارەکەیان پەشیمان ببنەوە، بەڵام بە بۆکس و لێدان وەڵامیان دامەوە، پاش ئەو لێدانە ئیدی توانای هاوارکردنیشم نەما ئەو عەرەبانەیەی من لەناوی بووم بۆ ماوەی کیلۆمەترێك لە ناو شارەوە دوور کەوتەوە بە ئاراستەی هێڵی شەمەندەفەرەکەی دەرەوەی شاردا، منیان برد لەوێ لە ناو کۆمەڵێك گیا دایاننام هەر هەوڵی ئەوەم ئەدا کەس لەو ناوە بێت بتوانێت ڕزگارم بکات، بەڵام کەس نەبوو، سات لە دوای سات بێ هیوا دەبووم کاتەکان زۆر بە خێرایی تێدەپەری کات بوو بە شەشی ئێوارە کەچی من کەسێکم دەست نەکەوت بیکەمە پەناو لە دەستی تاوانباران ڕزگارم بکات.

لەو وەختە ناخۆشەدا پێم دەوتن ئاخر ئێوە چیتان لەم من ئەوێت بۆ وازم لێ ناهێنن، بەلاّم بێ سوود بوو یەكێك لەو تاوانبارانە كە ناوی ڕەزا بوو وتی: بەسە گریان هاتەلامەوە بۆ ئەوەی مەبەستە گلاّوەكەی خۆی بێنێتەدی وتی: مەگری ئەگینا ئەتكوژم، ئیتر هات بۆم منیش زۆر بەرگریم كرد نەیتوانی هیچ بكات داوای لە ڕەفیقەكەی كرد كە ناوی سەید بوو بۆ ئەوەی بە یەكەوە ئازارم بدەن. ئای كە چەندە دڕەندە بوون زۆر ئازارم بەدەستیان چەشت جل وبەرگیان لەبەر دڕاندم جگەرەیان پێ ئەكردو بە لەشی من دەیانكوژاندەوە هەموو لەشم بوو بوو بە تەپڵەكی جگەرە، بەكوژانەوەی جگەرەكانیان هەموو جەستەم دەكزایەوە، هەموو ئەو ئازارەم قبووڵ كرد تەنها لە بەرامبەر ئەوەی ژیانم لێ تێك نەدەن و ئایندەی خۆم ومێردەكەم ئاگر تێ بەرنەدەن، چونكە من تازە بووكم هێشتا چەند هەفتەیەك بەسەر زەواجەكەمدا تێنەپەریوە. پێنج سەعات هەر لە ئازاردا بووم تەواو هەموو ئەندامانی جەستەم لە جووڵە كەوت دوای لێدانێكی زۆرو برینداركردنی سكم و پشتم و دست و هەر دوو قاچم بە درێژایی ئەو پێنج سەعاتە وەك باران خوێن بە جەستەمدا دەهاتە خوار، بەلاّم سەرەرای ئەوەش هەستم بە هێزو توانا دەكرت بۆ ئەوەی بەرگری لە خۆم بكەم، بەلاّم دواتر هەستم كرد هیچ هێزم تیا نەما، تەنانەت نەمدەتوانی پەنجەی دەستم بجوڵێنم، ئیدی ئاگام لە خۆم نەما زۆر شتیان لێ كردم ڕەزا هەموو ئاڵتوونەكانی بردم كە بریتی بوو لە زنجیرێكی ئاڵتوون سێ سنارەو ئەنگوستیلەیەكی ئاڵتوون و ملوانكەكەی ڕۆژی زەواجم ئەوەی كە مێردەكەم پێشكەشی كردم.

ڕاستەوخۆ گەڕان دەستی پێ كرد بە دوای تاوانباراندا، عەمیدی ئاسایشی باكوور كۆمەڵێك زانیاری دەركرد سەبارەت بە تاوانباران

پاش دەستکەوتنی زانیاری لە سەر تاوانباران بەڕێوەبەری لێکۆڵینەوەکانی تاوان و سەرۆکی لێکۆڵینەوەکانی تاوان توانیان بە ماوەیەکی کەم تاوانباران دەستگیر بکەن، کە هەواڵەکە گەینرا بە سەنتەری ئاسایشی باکور ئەفسەرێکی زۆر کۆ بوو بۆوە بەمەبەستی گەڕان بە دوای تاوانباراندا، چونکە لەو ناوچەیەدا یەکەم جار بوو تاوانێك لە هاوشێوەی ئەم تاوانە روو بدات.

عەقیدو وەکیلی بەڕێوەبەرایەتی گەڕان تایبەت بۆ نەهێشتنی تاوان و مووقەدەم کۆ بوونەوە لە سەر دانانی پلانێك بۆ دەست گیر کردنی تاوانباران، ئەویش لە ڕێگەی کۆمەڵێك زانیاری وەسفی کە لە لێکۆڵینەوەکەدا بوو کە رفێنراوەکە باسی کردبوو بە درێژایی رۆژ هەموو بە هەماهەنگی یەکتر کە بریتی بوو لە عەقیدێك کە سەرپەرشتی کرۆپێکی ئەکرد، هاوکات سەرۆکی لێکۆڵینەوەکانی سەنتەر کە ئەوانیش بریتی بوون لە دوو رائید بە رەو شوێنی رووداوەکە بە ڕێ کەوتن، بە تایبەتی ئەو شوێنەی کە کە ژنە رفێنراوەکە دیاری کردبوو، پاش بینینی کۆمەڵێك بەڵگە کە ئاماژە ئەکات بۆ رووداني تاوانێك لەو جۆرە وەك بینینی خوێن پاشماوەی جل وبەرگی دڕاو کە نیشانەی خوێنی پێوە دیار بوو، هەر بۆیە لێرەوە قۆناغی ناخۆشی دەست پێ ئەکات ئەویش بە پرسیار کردن لە خەڵکی ئەو ڕێگایەی کە بەرەو شوێنی رووداوەکە دەڕوات، بۆیە بۆ دەستکەوتنی زانیاری روو بە رووی کۆمەڵێك شت دەبینەوەی کەچی بۆ دەستکەوتنی زانیاری بینیمان هەموو ئەترسن، وەڵامەکانیان بۆ ئێمە یەك وەڵامە ئەویش کە بریتی بوو لە وەڵلا ئێمە بەس گوێمان لە هاوارێك بوو، بەڵام دەرنەچوون چونکە هەموومان سەرقاڵی کار بووین .

پاش ماوەیەك لە پرسیارکردن جەنابی رائید بانگی ژنەکەی کردەوەو جارێکی تر بە یەکەوە بە بابەتەکاندا چوونەوە، بەلأم ئەم جارەیان هەندێك وێنەی گومان لێ کراوی پێ نیشان دا کە لە ناویندا کەسێك دیاری کرا ئەویش کە ناوی ڕەزا بوو، وتی: گوێم لەم ناوە دەبوو کە گورگەکان بانگیان ئەکردو زۆریشی لێ دەترسان دوای ئەوەی بۆ جەنابی رائیدی باس کرد، لێرەوە هێواش هێواش داوی ئەم مەتەڵە شیدەبۆوە نزیك دەبوونەوە لە چارەسەر.

لەسەر ئەم زانیارییە مووقەدەمی پشکێنەر گەیشتە ئەو زانیارییە کە بریتییە لە سواربوونی ڕەزاو کەسێکی تر بەناوی مەحموودی عەرەبانچی لە عەرەبانەکەیو هەروەها کەسێکی تریش بەناوی ڕەمەزان کە تەمەنی ١٥ ساڵە.

پاش دەستکەوتنی ئەم کۆمەڵە زانیارییە بەڕێز جەنابی لیوا زۆر بە وردی خوێندنەوە بۆ رووداوەکە ئەکات، فرمان بە جەنابی عەمید ئەکات مەحموودو ڕەمەزان دەست گیر بکرێن لێکۆڵینەوەی وردیان لەگەڵ بکرێت بۆ دان نان بە تاوانەکانیان وهەروەها لە ڕێگەی ئەوانیشەوە توانرا هەر دوو هەرزەکار دەست گیر بکرێن پاش خۆشاردنەوەیان لە شوێنێکی چۆڵدا.

لە بەردەم جەنابی عەمید ڕەمەزان وتی گەورەم بەخوا من هیچ تاوانێکم نییە من دانیشتبووم لە نزیك عەرەبانەکەی باوکم چاوم بە ڕەزا کەوتو سەیدیشی لەگەڵ بوو سواری عەرەبانەکە بوون پێی وتم دەرچۆو بکەوە دوای ئەو کچە کە عەبایەکی ڕەشی لە بەر بوو منیش بە تەنیشتیدا دەڕۆیشتم ئەوان قسەیان لەگەڵ ئەکرد، بەلأم لە نزیك بینایەی ئەنجوومەنی شار وتیان بوەستە وەستام ئیدی هەر بە جل

وبەرگەکەی خۆی بەستایانەوەو کەوتنە لێدانی و خستیانە ناو عەرەبانەکە ئەویش هاواری ئەکرد بەڵام زۆریان لێ داو هەروەها لە من و مەحموودی عەرەبانچیشیان دا ئەوەی کە لەگەڵم بوو.

لە ژوورێکی تەنیشت جەنابی رائید گفتوگۆی لەگەڵ مەحموودی عەرەبانچی ئەکرد، بەڵام مەحموود کۆمەڵێك زانیاری چاکی دایە دەست ئەویش ئەوە بوو دوای ئەوەی بەرەو ناوچە کشتوکاڵیەکە بەڕێ دەکەون کە دەگەنە ئەوێ، ڕەزاو سەید داوا ئەکەن بچن بانگی ڕەفیقێکی خۆیان بکەن کە ناوی مووستەفایە پێی ڕابگەیێنن کە ڕەزا داواتی کردووە ئێوارە خوانێکی بەلەزەت مەسڵەحەتێکی زۆر خۆش ئەبێت، هەر وەکو ڕەزا پێ وتین ئێمەش ئەوهامان کرد، بە عەرەبانەکە چووین مووستەفامان هێناو ڕەزا وتی دوور کەونەوە ئێمەش بە قسەمان کرد دواتر گوێم لە هاواری کچەکە بوو .

ئەفسەری لێکۆڵینەوە نەیدەتوانی بە ئیسراحەت دابنیشێت حەماسەتی بەرز بوو بۆوە بۆ دەستگیر کردنی تاوانبار دوای ئەوەی ناسنامەی تاوانبارانی بە دەست کەوت، ئیدی گەڕان دەستی پێ کرد بە هەموو لایەکدا، بەراستی هەمووان بۆ ماوەی ٤٨سەعات لە هەوڵی گەڕان وپشکنین بوون بە دوای تاوانبارانـدا لە میانی هەوڵەکانیان کەسایەتی و ناسنامەی تاوانباران هەموو دەرکەوت ئیدی گەڕان دەستی پێ کرد بە دوای شوێنی خۆشاردنەوەیان لە ماوەی ٢٤ سەعاتی رابردوودا گەڕان بە دوای شوێنی تاوانبارانـدا جەختی زۆر لەسەر دەکرایەوە، تاوانبارانی داواکراو تا ئێستا بریتین لە مووستەفاو ڕەزاو سەید.

زانیارییەکی هەنووکەییەان پێ گەیشت لە هەندێك سەرچاوەی

نهێنییەوەکە ئاماژە بەوە ئەکات مووستەفا لە یەکێك لە دێیەکانی نزیك پارێزگابێ بۆیە جەنابی رائید زۆر بە وریایی خوێندنەوە ئەکات بۆ چۆنێتی دەستگیرکردنی بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش باشترین کەس تاوانبار سەیدە، لە رێگەی ئەوەوە دەتوانرێت جیگەی تاوانبار دیاری بکرێت. پاش چەند هەوڵێك بۆ دەستگیرکردنی توانرا پیاوانی ئاسایش دەستگیری بکەن و دان بە هەموو وردەکارییەکانی تاوانەکەدا بنێت، هەروەها توانرا لە رێگەیەوە کەسێکی تریشیان پێ بناسێنن بەناوی ئیبراهیم کە رەزا بانگی کرد بوو بۆ شوێنی رووداوەکە گوایە کۆمەڵێك شتی هەیە ئەیەوێت پێی بفرۆشێت، بەڵام کاتێك کە دێت بۆلای رەزا دەبینێت کچێك بە شێوەیەکی زۆر ناشرین لە بەر دەستیان کەوتووە کە بەم شێوەیە دەیانبینێ ئەبێتە شتێکی لە ناکاو بۆ ئەو ئیتر ناکۆکی رووئەدا لە نێوانیان لە ئەنجامدا ئیبراهیم شادۆف دەستی کچەکە دەگرێت رزگاری ئەکات پێش ئەوەی رەزاو تاوانبارانی تر بیکوژن .

لە سەر تیشکی ئەم زانیارییانە گەیشتنە ئەو راستییەی کە رەزا لە دێیەکی دەوروبەر بوونی هەبێ راستەوخۆ رائید تاریق هیلالی گروپێك پێك دێنێت و پشت دەبەستێك بە هەندێك زانیاری کە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات رەزا دەیەوێت لە یەکێك لە ئاهەنگەکان ئەم ئێوارەیە ئامادەبێ وەك کەسێکی نەناسراو، بەڵام ئامادە نەبوو دوای ئەوەی بۆسێیان بۆ نایەوە، بەڵام پێ دەچوو ئەو ئامادە بوبێت، هەر چەندە دوای ئەوەی زانرا هەواڵەکە بەو شێوەیە بووە، کۆمەڵێك ناکۆکی روویدا لە نێوان ئەو تاوانبارەی کە دەبوو بۆ پیشاندانی شوێنی رەزا ئامادە بوایە تووشی لێدانێکی زۆر هات بەتایبەتی لە لایەن ئەو هاورێیانەی کە پێیان زانی زانیاری داوەتە دەست پۆلیس، بە دەستی ئەوان لێدانێکی چاکی

خوارد، خەریك بوو لە ژێر دەستیان بمرێت، ئەگەر پیاوانی ئاسایش نەگەیشتنایەتە سەری لە بەر خراپی باری عەمید نەیتوانی هیچ پرسیارێکی تری ئاراستە بکات ڕاستەوخۆی ڕەوانەی نەخۆشخانە کران.

بووکەکە لە قسەکانیدا لە بەردەم ئەفسەرانی لێکۆڵینەوە تەئکیدی لەسەر ئەوە کردوە کە تاوانباران ڕفاندوویانەو ئازاریان داوەو هەوڵیان داوە لاقەی بکەن و دەست درێژی سێکسی دەر حەق ئەنجام بدەن، بەلاّم ئیغتیساب نەکراوە. . .چونکە لەوە دەترسا مێردەکەی ئەم ڕاستییە بزانێت و ببێتە هۆی جیابوونەوەیان، بەلاّم پارێزەرەکانی پێداگیریان لەسەر ئەوە کرد کە ئەبێت لێدوانی تەواو سەبارەت بە چۆنێتی ڕووداوەکە بدا هەروەها ئەوەش ڕابگەیەنێت کە بە دەستی ئەوان ئیغتیساب کراوە بۆ ئەوەی تاوانباران بە توندی سزا بدرێن. . . بەم شێوەیە کفتوگۆ لەسەر ڕووداوەکان ئەکات لەبەردەم وەکیلی نیابە ئەویش لێی دەپرسێت و ئەڵێت چۆن توانیت لە دەستیان ڕابکەی؟ ئەویش ئەڵێت: پێش بەربەیان کەسێك هاتە ئەو شوێنەی کە من تیادا خڵتانی خوێن کرام، کە ناوی ئیبراهیم بوو هاتبوو بۆ ئەوەی شتێك لە ڕەزا بکرێت، کە کاتێك منی بینی کەوتە لێدانی ئەوان منی لەگەڵ خۆی برد بە درێژایی هێڵی شەمەندەفەرەکە ڕۆیشتین تا گەیشتینە سەر جادەی سەرەکی سەیارەیەکی ڕاگرت و داوای لە شۆفێرەکە کرد بمگەێنێتە ناو شار دوای ئەوەی شۆفێرەکە منی گەیاندە ناو شار ڕاستەوخۆ چوومە ماڵی باوکم و تەواوی هەموو چیرۆکەکەم بۆ گێڕانەوە، زۆریش لەوە دەترسام مێردەکەم تەلاّقم بدات ئەگەر بێت و ئەم هەواڵە ببیستێ، بەلاّم ئێستا تەنها ئەوەندەم بەلاوە گرنگە تاوانباران

بگەنە سزای خۆیان. . . دواتر وەکیلی نیابە فرمان ئەدات نمایشێکی یاسایی بکرێت بۆ ناسینەوەی تاوانباران لە نێوان کەسانی هاوتەمەنی نزیکی خۆیان دابنرێت بۆ ئەوەی ببینرێن. بەلاّم لە میانەی هاتنە ژوورەوەی بووکە تاوان لێکراوەکە کە بینی تاوانباران خۆیانن بێ هیچ تسەیەك بە نینۆك کەوتە گیان مووستەفاو ڕەزا، ئەیویست بیانکوژێ، بەلاّم هەولْ درا بە زۆر لەوان دوور بخرێتەوە کەچی لەبەردەمیدا کە ئیبراهیمی بینی ڕاستەوخۆ سەری نواند لە بەردەمیداو ویستی پێلاّوەکانی ماچ بکاتو وتی: ئەمە ئەو پیاوەیە کە ڕزگاری کردم.

پاش لێکۆڵینەوە کە بەسەرپەرشتی بەرێز راوێشکار وپارێزەری خۆرهەلاّتی تەنتا وەکیلی نیابەی یەکەم فرمانی زیندانی کردنی بۆ هەر یەك لە تاوانباران ڕەزا، مووستەفا، سەید بە زیندانی کردنیان بۆ ماوەی چوار رۆژ بەلاّم دادوەر نویی کردەوە بۆ ٤٥رۆژ لە لایەکی ترەوە مەحمودو ڕەمەزان نەیانتوانی بڕی ئەو پارەیە بدەن کە بۆ کەفالەت دانرا بوو ئیدی ئەوە بوو لە بەرامبەردا ئەوانیش زیندان کران، بەلاّم لە بەرامبەردا فرمانی ڕزگار کردن بۆ بەرێز ئیبراهیم دەرچوو ئەویش بە کەفالەی پارەدان بە بڕی ۱۰۰ جنێهی لە بەر ئەوەی لە کاتی بوونی لە شوێنی ڕووداوەکە دەزگاکانی پۆلیسی ئاگادار نەکردۆتەوە.

بەدواداچوونی هەواڵی ڕووداوەکەو چۆنێتی دەستگیرکردنیانم سات لە دوای سات ئەکرد، چاوم کەوت بە تاوانباری دووەم

"سەید مەرسی" تەمەن ٢٦ ساڵی عازەب پرسیارم لێ کرد لە سەر تاوانەکە ئەویش وتی:

منو ڕەزا برادەرین کاتی عەسر بوو لە دەرەوە دانیشتبووین هەردوکمان سەرخۆش بووین، ئەو کچەمان بینی بەرێگادا دەڕۆیشتین

وتی هەڵسا با بچین بیرفێنین و ئەمرۆی لەگەڵ بەرینە سەر، ئیتر هەموو شتێکمان پێ بوو توانیمان تەعەدای لێ بکەین راستە ئێمە تاوانبارین بڕوا بکە ئەوەی لەگەڵ ئەو کچەدا کردیان لەگەڵ من بیانکردایە وەڵلا ئەمکوشتن...

بەڵی من شایەنی لە سێدارەدانم. . . لە سێدارەم بدەن . . .، چونکە وێنەی ئەو کچە خەیاڵمی داگیرکردووە، کە کاتێك هاواری ئەکرد و دەگریا و بەرگری ئەکرد وێنەکانی لە بەر چاوم ون نابێت، ناتوانم بخەوم.

وازم لەو هێناو رووم کردە تاوانباری سێیەم ئەویش کە مووستەفا میکانیکی ئۆتومبێل بوو تەمەن ٢٢ساڵ وتی:

ڕەزا ونی کردم ئەو ١٠٠ جنێهی لێم وەرگرتبوو هەر چەند داوام لێ کرد بمداتەوە بەڵام نەیدەدایەوە، زۆرم بەلاوە سەیر بوو کەسێکی بەدوام ناردووە سەعات یەك ونیو، ئەڵێت وەرە داوانم کردووی بۆ بابەتێك کە کاتێك هاتم ئەو کچەم بینی لەگەڵیان بوو داوای لێ کردم لەگەڵی رابووێرم لە بەرامبەر ئەو قەرزەی کە لای بوو، هاواری کرد بە روومدا وتی پێت ئەڵێم جووتبە لەگەڵی. . . بەڵی شەیتان کۆنترۆڵی کردم (ئەم جۆرە شەیتان تاوانبار ئەکەن کە چی خۆیان مامۆستای شەیتانن) وەڵلا ئەوەی وا لە خوشکم بکات ئەبێت لەشی لەت لەت بکەم خوێنەکەی بخۆم بەڵێ من شایەنی لە سێدارەدانم بەڵێ. . .

وازم لەو هێناو نزیك بومەوە لە هەر دوو مێرد منداڵەکە مەبەستم ڕەمەزان ومەحمودە ئەوان تەئکیدیان لەسەر ئەوە کردەوە کە هیچ تاوانێکیان نییە ئەوان تەنها لە ڕەزا ترساون بۆیە هاوکاریان بوونە.

لەگەڵ گەنجە رزگارکەرەکە قسەم کردو ئەویش وتی: من ناوم

ئیبراهیمە میوە فرۆشم تەمەنم ٢٥ ساڵە لە کاتێکدا من دەرۆیشتم گوایە هەندێك شتیان هەیە من بە مەبەستی ئەوە چووم لێیان بکڕم پێیان دەوتم شتێك هەیە تۆش وەرە با خێری لێ بکەی، کاتێك کە رۆیشتم بینیم کچەکە بە دەستیانەوەیە بە کەیفی خۆیان ئارەزووە سێکسییەکانیان لەگەڵ بە تاڵ ئەکەنەوە، منیش غیرەتم قبووڵی نەکردو دەستی کچەکەم لەوان سەندو هەڵهاتین، چونکە گوێم لە ڕەزا بوو ئەیوت بە کەیفی خۆمان لەگەڵی رادەبوێرین پاشان دەیکوژین منیش بە خوشکی خۆم زانی و ڕزگارم کرد.

# شەوێکیان لەگەڵ برادەرەکانم لە یەکێك لە ئاهەنگەکان ئەهاتینەوە؟!

لـە کاتێکـدا فرمێـسك بـە چـاوەکانیدا دەهاتـە خـوار هیـشام ڕەجـەبی تەمـەن ٣٠ سـاڵ بـەم شـێوەیە باسـی چیرۆکی خـۆی کـرد مـن دوو سـاڵ ونیـوە پرۆسـەی هاوسـەرگیریم ئەنجامـداوە، وەکـو چێـشت لێنـەرێك لـە یەکێك لە چێشتخانەکان کار ئەکەم، ژیانم زۆر لە ناخۆشیدا بوو، چونکە بە تەواوی لە ڕەگ و ڕەچەڵەکی دایکم دوورکەوتمەوە، بەتایبەتی پاش کۆچکردنی کە ئێستا ماوەیەکی زۆری بەسەردا تێپەڕیوە، کەسم نەماوە تەنا هەندێك زڕ برا نەبێ کە هیچ بایەخێکیان پێ نەدام، هەتا تەنانەت باوکیشم هیچ بایەخێکی پێنەدام وەکو بێ ماڵێك هەر شەوی لە لای کەسێکی نزیك دایکم ئەخەوتم و بۆ ماوەیەك دەمامەوە، پاش ئەوەی ژیانم بۆ ماوەیەك بەم شێوەیە تێپەری هەوڵم دا فێری چۆنێتی چێشت دروست کردنبم، ئیدی هەر کات بوارم هەبووایە بۆ خۆم لە چێشتخانەی یەکێك لە ئوتێلەکان کارم ئەکرد، بەڵام سەرەرای ئەوەی ژیانم چەند لە ناخۆشیدا بوو، باوکیشم زۆر بە شێوەیەکی خراپ مامەڵەی لەگەڵ ئەکردم هەتا بۆ چەند جارێك هەوڵی خۆ کوشتنم ئەداو جارێکیش گولەیەکم لەلای راستی سینگمدا، ئەها بڕوانە (کراسەکەی داناو ئاماژەی بۆ شوێنی برینەکە ئەکرد شوێنی گولەکەی پێ نیشان دام) بەردەوام بوو لە قسەکان و وتی: من زۆر ئازارم چەشت لە قسەکانی بەردەوام بوو فرمێسك بە چاوەکانیدا دەهاتە خوار، دیسانەوەی وتی:

من زۆر ناخۆشیم بینی هەموو ژیانم بە ئازار بردە سەر، قەت خۆشیم لە ژیانی خۆم نەبینی هەمووی ئازار بوو، هەتا تەنانەت ئەو کچەی لە سەرەتای ژیانمدا کە ناسیم فێڵی لێ کردمو فریویدامو فرۆشتمی لە نیوەی ڕێدا جێی هێشتم، ئەو کچەی وای لێکردم هەموو ژیانی لە بەر چاو بردم، تەواوی ساڵانی رابردوم هەموو هەوڵێکم بۆ ئەوە بوو ئەو کچەی کە خۆشم ئەوێت دڵنیای کەمەوە کە خۆشم ئەوێت، بەڵام بەداخەوە منی فرۆشت بە نرخێکی زۆر کەم، بەڵێ من شایەنی ئەوەم کە بەسەرمدێ، لەوانەشە ئەمە تۆڵەی ژنەکەم بێ خوا لێم دەکاتەوە (لەو کاتەدا دەستی بۆ ژنە بەستراوەکەی درێژ کرد) لەو قسانەدا هەوڵی ئەوەی ئەدا بڵێت ژنەکەم بێ تاوانە. . . سەباح بێ تاوانە من هەموو شتێکم کرد!

لە پاش کۆمەڵێك لە گریانو نوزانەوەو دەربڕینی پەشیمانی، لەگەڵ ئەوشدا هیشام سەباحی خێزانی نەخۆش بوو، نەخۆشی شەکرەی هەبوو، سەباح ویستی ئارامی بکاتەوە لە کاتێکدا کە هەوڵی ئەکدا بڵێت بێ تاوانە ئاماژەی بۆ سەباحی خێزانی کردو وتی: سوێند بەخوا سەباح بێ تاوانە، من هەموو شتێکم ئەنجامدا، لە هەمان کاتیشدا زوڵمم لەویش کرد، بڕوام پێ بکە رووی کردە مووقەدەمو سەرۆکی لێکۆڵینەوە، قوربان بڕوام پێ بکە ئەوبێ تاوانە ستەم لێکراوە، ئاگای لە هیچ شتێك نییە، بەدرێژایی کات ئەو هەر لە نەخۆشخانە بوو، سەبا ح دەستی نایە سەر شانیو ئارامی بکاتەوەو پێی وت: لە قسەکەت وا دەرەکەوێت زۆرت خۆشەوێتو لە ژیانی ئەترسی ئەی کەوایە بۆ وات کرت؟ وەلامی دایە زۆر بە پەشیمانیەوە سەرەتا زۆر غەریب بوو پیشبینی شتی وام نەکرد، بەڵێ سەخت بوو، چونکە شەش مانگ بە

سەر زەواجەکەماندا تێنەپەر بوو بوو، شەوێکیان لەگەڵ برادەرەکانم لە یەکێك لە ئاهەنگەکان ئەهاتینەوە لە کاتێکی درەنگدا دوای نیوە شەو بوو سەیارەیەکی تاکسیم راگرت بۆ ئەوەی بگەرێمەوە بۆ ماڵ پاش ماوەیەك لە رۆیشتن ئەم ئافرەتە سەرکەوت لە تەنیشتم دانیشت، بە هیچ شێوەیەك تەماشایم نەکرد، بەلاّم چاوی بە چاوم کەوت لە رێگەی ئاوێنەی سەیارەکەوە، نازانم چی وای لێکردم بە چاو وەلاّمی چاوی بدەمەوە، راستەوخۆ مۆبایلەکەی دەرهێنا وەك بڵێت بۆ یەکێکی زۆر مووهیم تەلەفۆن بکات. . . گەورەم هەمووی تەواو بابەتەکە کۆتایی پێ هات تێگەیشتی ئیدی لەم نێوانەدا قسەکردنەکانی کۆتایی پێ هات ومۆبایلەکەی داخست . . .

دوای ئەوە تەلەفۆنەکەی تەواو کرد لە تەنیشتم داینا، دایە قەد چۆکم بە پەنجەکانی لە سەر جانتاکەی کە لەسەر رانی داینا بوو، ئەیروانیو لە ئاوێنەکەوە تەماشای ئەکردم، منیش راستەوخۆ تێگەیشتم بە بێ ئەوەی بێڵم شۆفێرەکە هەست بە هیچ شتێك بکات مۆبایلەکەیم هەڵگرتو ژمارەکەی خۆم بۆی نووسی، کاتێك کەرامەوە بۆ ماڵ هاوسەرەکەم خەوتبوو، ئیتر تەلەفۆنم بۆ کردو بە یەکەوە قسەمان کرد لە قسەکانا وتی: من هێشتا کچم شووم نەکردووە، لە پاشان وتی: خۆشم نازانم بۆ هەر لە یەکەم نیگاوە تۆم خۆش ویستو چویتە دڵمەوە، بەراستی شێوازی لە قسەکردندا وای لێکردم بڕوای پێ بکەم حەزم ئەکرد بەو شەوە بچم قسەی لەگەڵ بکەم سەعاتەکانی شەو زۆر بە سستی تێپەر دەبوو، زۆر حەزم ئەکرد رۆژ بێتەوەوە جارێکی تر بڕوانمە نیگاکانی.

هیشام بەم شێوەیە بەردەوام بوو چەند جارێك چاوپێکەوتنو

دانیشتنیان بە یەکەوە ساز ئەکرد، لە هەرجارەو لە شوێنێك جارێك لە لای یەکێك لە هاورێکانی ئەوی تر لە شوێنێکی تر، دوای ئەوەی هەموو لایەرەکانی خۆی هەڵدایەوە بۆم وتی: من دوو شتم بەلاوە گرنگە یەکەمیان پارە ئەوی تر خۆشەویستی، ئەو رۆژە لە قسەکردن بووینەوە، بیرمان لەوە کردەوە ژوورێك بە کرێ بگرین هەر بۆیە پاش چەند رۆژێك چارەسەرێکی دانا کە بچین بۆ شووقەی یەکێك لە هاورێکانی کە بۆ چەند جارێك لەوێ بوین بە تەنها، بۆیە رۆژی دوایی کە رۆژی شەممە بوو ئەوەشم دەزانی کە هاوسەرەکەم رۆژی پشووی لە نەخۆشخانەیە رۆژی هەینیە لە جاتی رۆژی یەك شەممە، لەبەر ئەوەی من و ئەو رۆژی دەرچوون و پشوومان هەینی بوو بۆیە رۆژێك پێشتر پێی وتم: من رۆژی یەك شەممە ئەرۆم سەردانی ماڵەوە ئەکەم، کاتێك ئەمەی پێ وتم نەمدەزانی لە خۆشیا چی بکەم، چونکە بە تەنها لە شووقەکە دەمێنمەوە بە خێرایی تەلەفۆنم بۆ عەبیر کرد و ئەم هەواڵەم پێ راگەیاند سەرەتا عەبیر دوودڵ بوو، بەڵام هەوڵم دا قەناعەتی پێ بکەم کە هەموو شتێك تەرتیبە کەس پێمان نازانێ، مەگەر خەڵکی بتناسن یان پۆلیس، زۆر بەخێرایی رازی نەبوو وای لە خۆی کرد وەك بڵێت لێت عاجز بووم، پێویستە ئاشتم بکەیتەوە منیش وەعدی ئەوەم پێدا دیارییەکی بۆ بهێنم و هەندێك قسەی خۆشم بۆ کرد و ئیدی ئاشت بووینەوە، بۆ رۆژی دوایی سەعات دەی سەر لە بەیانی بینیم تەقەی لە دەرگاداو ئیتر ئەو رۆژە بە یەکەوە بووین، چەند جارێك بەم شێوەیە چاوپێکەوتنمان ساز ئەکرد جارێکیان عەبیر لێی پرسیم باشە ئەوە ژنەکەت لە کوێ سەری چاك ئەکات یان ئەچێتە کام سالۆن؟ وتم نازانم! وتی هەوڵ بدە بزانی دوای قسە ئەکەین.

پاش چەند ڕۆژێك زانیم سەباحی هاوسەرم ئەچێتە چ سالۆنێك ئەچووە سالۆنێکی نزیك ماڵمان هەر وەك عەبیر نەخشەی بۆ کێشام هەوڵ بدەم قەناعەت بە سەباح بهێنم کە ئەم ڕۆژانەی دوایی چاوم بە ڕەفیقێکی کۆنم کەوتووە پێی وتووم کە خوشکێکی بە ناوی عەبیرەوە لە یەکێك لە سالۆنەکان کار ئەکات لە مەنیل منیش وتم خۆت ئەزانی ئەو ناوچەیە هەموو ژنەکانیان های لایف دەژین چی ئەڵێت پێی بڵێم جوانترین جوانکاریت بۆ بکات؟ ها چی ئەڵێیت سەباح؟ بەهەر حاڵ پێی خۆش بوو وتم ڕەنگە ئێستا ئەگەر دەعوەتی ماڵەوەی بکەین هەر شەرم بکات داوای پارەش بکات ها چی ئەڵێت؟ سەباح وتی زۆر چاکە ڕۆژی پێنج شەممە دەعوەتی ئەکەین. . . بەم شێوەیە منو عەبیر پلانەکەمان سەری گرت بۆ ئەوەی هاتنەکەی زۆر فەرمی بێت هەتا ئەگەر یەکێك لە هاوسێکانیش ئێمەیان بینی زۆر ئاسایی بێت.

پاش شەش مانگ لە ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیرێکەیان پێم وت ڕەنگە مێردەکەت لەگەڵ ژنێکی تر پەیوەندی هەبێ چی ئەڵێت سەباح؟!

ئەویش هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی: من نازانم چی بکەم وا هەست ئەکەم، چونکە ماوەیەکە هەڕەشەی تەڵاقم لێ ئەکات ئەگەر بێتوو پرسیاری لێ بکەم یان دەست تێوەردەمە ناو کارەکانی قەت قبووڵی ناکات، پرسیاری ئەوەی لێ بکەم لە کوێ بوویت یان لەگەڵ کێ شەوان ئەبەیتەسەر منیش ئەوە حاڵمە کە دەمبینی شەکرەم هەیە وهیلاكو نەخۆشم دواتر من بە ڕۆژ لە نەخۆشخانەمو لەگەڵ نەخۆشەکانم خەریکم!

پرسیارم لێ کرد باشە ئەگەر بەم شێوەیە بێت ژیانتان پێتوایە

بەردەوام بن؟ سەباح بە فرمێسکەوە وەڵامی دایەوەو وتی: بێگومان نا پێویستە جیابینەوە من هەر گیز ناتوانم چیدی ئەم هەموو ئیهانەیە قبووڵ بکەم! هیشام وەڵامی دایەوەو وتی منیش هەروەها قبووڵ ناکەم جارێکی تر ئەو لە ناخۆشیدا بژی بەسە ئەوەی کە بینی من هەڵەم کرد دەرحەق بەوو دووچاری دەیان ناخۆشیم کرد. . . بەراستی ئەو بێ تاوانەو هیچ گوناهێکی نییە.

سەباح پرسیاری لە هیشام کرد وتی: ئەی باشە ئەو هەموو وێنەو فیلمانە چی بوون لەگەڵ عەبیر؟ هیشام لە وەڵامدا زۆر بە هێمنی وتی: عەبیر رۆژی یەك شەممە هاتە ماڵ وەك جارەکانی تر کە هات وتی هەندێك وێنەی جوانت پێ نیشان ئەدەم منیش وتم خێر ئەبێ چی بێت وتم ئادەی بزانم چیە؟ بەلأم ئەوە ئەزانی کە سەباح بۆ ماوەی سێ رۆژ لە ئەسکەندەرییە مایەوە لەگەڵ ڕەفیقێکی ناوی ئەحمەدە بوو ئەو پێی ناساندم نەك تەنانەت هەر ئەو بەڵکو دەیان کەسی تری پێ ناساندم لە ناوەوەو دەرەوەی ولأت بەهەر حاڵ کە گەرایەوە لە ئەسکەندەرییە جانتاکەی دەرهێنا هەندێك وێنەی سەرنج ڕاکێشی پێ نیشان دام کە لەگەڵ چەند کەسێك گرتبووی لە چەند وەختێکی نائاساییدا دواتر خۆی باداو وتی: ئەتەوێت خۆمو خۆت بە یەکەوە وێنەی لەوە جوانتر بگرین؟ وتم ئاخر لێرە هەر خۆمو خۆتین کێ وێنەمان بگرێت؟ ئەویش زۆر بەشێوەیەکی سادە وتی: باشە ئینتیساری هاوڕێم بانگ ئەکەم ئەو وێنەمان بگرێت.

پاش دوو رۆژ خۆی وئینتیسار هاتنە ماڵ ئینتیسار وێنەمانی گرت بەو بۆنەیەوە ئەوەی دەزگاکانی لێکۆڵینەوەی دەستی کەوتووە وێنە نەبوو بەڵکو فیلم بوو هێشتا وێنەکانمان چاپ نەکردووە.

بەم شێوەیە لە بەردەم لێکۆڵینەوەو بە ئامادەبوونی هەوو لایەنێك هیشام وهاوسەرەکەی، عەبیر. عەبیر لە لێکۆڵینەوەدا ئەوەی راگەیاند هیشام وهاوسەرەکەی هەڵساون بە بێهۆشکرنی، لە پاشان هیشام ئیغتیسابی کردووەو تەواوی وێنەکانی تۆمار کردووە هەڕەشەی ئەوەی لێکردووە کە بڵاوی ئەکاتەوە هەر چەندە عەبیر ئەوەی ڕەت کردەوە کە ئینتیساری هێنابێتە ماڵەوە بۆ گرتنی وێنە بەڵکو وتی: هەر وەکو رۆژانی ئاسایی ئەچوومە ماڵی هیشام بۆ جوانکاری قژی هاوسەرەکەی کە ماوە ماوە بە تەلەفۆن ئاگاداری ئەکردمەوە منیش ئەچوومە ماڵی، هاوسەرەکەی هیشامیش دڵنیابوو لە ئێمە هیچ شتێکی نەبوو، منیش متمانەم پێ کردن هەر کاتێك بچوومایە هیشام دەیگوت چی ئەخوێتەوە منیش هەر چیم داوابکردایە بۆی ئامادە ئەکردم، بەڵام ئەوەی سەیر بوو ئەم جارەیان کە شەربەتەکەی بۆ هێنام منیش خواردمەوەو پاش ماوەیەك لە هۆش خۆم چووم. عەبیر ئەم قسانەی لە بەردەم پۆلیس کرد هەروەها وتی: هیشامو هاوسەرەکەی هەڕەشەی ئەوەیان لێکردووم ئەگەر بێتوو من لەگەڵیان نەبم ئەوا دەیانو سەدان دانەی لێ چاپ ئەکەنو لە ناو خەڵکیدا بڵاوی ئەکەنەوە، هەروەوها عەبیر وتی داوایان لێ کردووم بە یەکەوە تۆڕێکی لەشفرۆشی پێکبهێنین بۆ ڕاکێشانی خەڵکی بەلای خۆیاندا . عەبیر ئەڵێت کاتێك لەهۆش خۆم چووم هەر چی ئاڵتوونم هەبوو بردیان .

لەبەردەم ئەم تۆمەتانەدا هیشام چیرۆکی وێنەکانی ڕەت نەکردەوە

بەلآم ئەوەی ڕەت کردەوە مەبەستی لە وێنەکان چی بووە، هەروەها ئەوەشی ڕەت کردەوە کە عەبیر خاوەن پیلانەکە هیچ جۆرە ئالتوونێکی بە قەدەوە نەبووە لێرەوە کێشەکەی شیتەڵ کردەوەو دەستی بە قسە کردو هەموو ڕاستییەکانی خستەروو ئەویش بەم شێوەیە: ڕۆژی یەك شەممە بوو عەبیر لە دەرگای دا هاتەماڵەوەو وتی هاتووم بۆ ٢٠٠جنێە دایکم لە نەخۆشخانەیە وتم ئێستا هیچ پارەیەك لە ماڵەوەم نییە چاوەڕێ بکە ڕۆژێك دوو ڕۆژ بۆت پەیدا ئەکەم، ئەوکات کە ئەم قسانەمان کرد لە ژووری نووستنەکە بووین هاوسەرەکەشم لە سەر کاری خۆی بوو لە نەخۆشخانە یەکێك لە ئەنگوستیلەکانی لە سەر مێزەکە دانابوو لەبەر نەخۆشییەکەی بچووك ببۆوە بۆیە نەی دەکردە پەنجەی منیش ئەوەم ئەزانی، بەلآم لە ناکاو عەبیر وتی ئەرۆمە خوارەوە لە کابینەکە تەلەفۆنێك ئەکەم بێگومان لە من ون بوو زیاتر لە سەعاتێك لە هەمان ژوور کە قسەمان تیادا ئەکرد، سەیرم کرد ئەنگوستیلەکە نەماوە، دوای ئەوەی هاتەوە پرسیارم لێ کرد ئەنگوستیلەکە چی لێهات؟ وەلآمی دایەوە وتی نەمبینیوە، بەلآم کە منی بینی تێکچووەمە وتی بوەستە من بە ١٢٣جنێە فرۆشتم منیش ئەوکات بێگومان هەڕەشەی ئەوەم لێ کرد ئەگەر بێتوو ئەنگوستیلەکە نەگەڕێنێتەوە ئەوا وێنەکان بلآو ئەکەمەوە، چونکە من نامەوێت کێشە بۆ هاوسەرەکەم دروست بکەم، چونکە بەو شێوەیە هەموو شتێك ئاشکرا ئەبێ.

عەبیر لە لێکۆڵینەوەکەدا ئاماژەی بەوە کرد هیشام‌و هاوسەرەکەی

مادەی هۆش بەریان خستۆتە ناو شەربەتەکەیەوە پاش وێنەیان گرتووەو دەست درێژی سێکیان خستۆتە سەرو هەروەها ئاڵتوونەکانیان دزیوە.

لە کۆتایدا پرسیارم لە هیشام کرد رۆڵی خێزانەکەت چی بوو لەم چیرۆکەدا؟

ئەوەیش لەوەڵامدا وتی: هاوسەرەکەم مەزلوومە هیچ تاوانێکی نەکردووە من قەت لە خۆم خۆش نابم بەوەی کە لەگەڵی کردم عەبیر ئەمەی کە دەیبینن شەیتانە هەموو ژیانی تێك دام تامی ژیانی لێ تاڵ کردم

# دایك ئیمانی نەما کچی خۆشی ئەفرۆشێت!

کاتێك ناوەڕۆکی ئەم چیرۆکە دەخوێنیتەوە ئەو ڕاستییەت بۆ دەرئەکەوێت ئەمڕۆ لە ڕووی ئەم زەمینە چ تاوانێك ئەنجام ئەدرێت دەرحەق بەیەکتر، ئەویش لە ئەنجامی دوورکەوتنەوە لە بەها جوانەکانی مرۆڤایەتی و یاسای خوا بۆ سەر زەوی.

چیرۆکی ئەم کچەی کە ئێستا بۆتان دەگێڕمەوە چیرۆکێکی خەیاڵی دووروستکراو نییە، بەڵکو چیرۆکی کچێکی بێ تاوانی ئەم سەردەمەیە سەردەمی سنوور بەزاندن ولەدەست دانی بەهاکانە.

سامییە لە خێزانێکی پەرشوو بڵاودا چاوی بە ژیان هەڵهێنا، هێشتا تەمەنی پێنج ساڵی تەواو نەکردبوو باوکی لە دایکی جیابۆوە، بە هۆی ئەوەی تووشی نەخۆشی دەروونی بووە، لە پاش جیابوونەوەی دایك وباوکی خانەی چاودێری کۆمەڵایەتی گرتیە خۆی و لە بەشی چاودێری منداڵە بێ باوکەکان، چونکە بەراستی کەسی نەما پشتی پێ ببەستێ دایکی لە سەر خەت ئیشی ئەکرد واتە بە زمانێکی عەرەبی پاراوو ئیشی لەشفرۆشی ئەکرد، هەر کەسێك بیویستایە لەگەڵی دەبوو، بەڵام سامییە هەر لە خانەی چاودێری کۆمەڵایەتی مایەوە تا ئەو کاتەی خوێندنی دواناوەندیشی تەواوکرد، بەڵام بە درێژایی ئەو ماوەیە کەس لە خێزانەکەی سەردانی نەکرد، تەنانەت داکیشی سەرەرای کارە تازەکەی کە کاری لەشفرۆشی بوو، چونکە زۆرێك لەو ژنە لەشفرۆشانە کچەکانی خۆشیان بەکار ئەهێنا بۆ پارە پەیداکردن و لەزەتی خۆیان،

بەڵام دایکی سامییە بە پێچەوانەوە بەڵکو تەنها مەبەستی لەو جۆرە کارە تێر کردنی ئارەزووەکانی بوو.

سامییە پاش بەسەر بردنی چەند ساڵێك لە خانەی چاودێری کۆمەڵایەتی ئیدی جانتاکەی هەڵگرتو دەستی کرد بە گەشتێکی نوێ ئەویش گەشتی گەڕان بە دوای خود(الذات) گەڕانێك قورستر لەگەشتەکەی کۆڵۆمبۆس بۆ دۆزینەوەی ئەمریکا، یان گەشتەکەی ئیبن بەتووتەو بینینی ئەو هەموو شتە سەیرو سەمەرانەی جیهان، چونکە شتە سەیرەکانی ئەو مێژووی پێ تۆمار دەکراو دەرس وپەندو ئامۆژگاری تیادا بوو، بەڵام بەسەرهاتەکەی سامییە پرچی ڕەش سپی ئەکات پەنجەی ڕەش و تاوانکاری تۆمار ئەکات، لە نێوچەوانی دایكو هەموو ئەندامانی خێزانەکەی کە پێك هاتبوو لە باوکێکی نەخۆش و دایکێکی سەرەڕۆو سێ برا، یەکێکیان تەمەنی ٢٨ ساڵەو خوێندنی قۆناغی سەرەتایی تەواوکردووەو بێ کارە ئەوی تر تەمەنی ٢٤ساڵەو هیچ خوێندنی تەواو نەکردووە ئەویش بە میرات نەخۆشیەکەی لە باوکیەوە بۆ هاتووە، بەڵام سێیەمیان تەمەنی ٢٠ساڵەو لە دووکانێکی ئاسنگەری کار ئەکات.

بەڵی ئەندامانی خێزانەکەی سامییە بەم شێوەیە پێك دێت، بەڵام سەرەرای ئەوەی سامییە ئەیزانی دایکی لە ڕابردوودا چەند توندو بێ ڕەحم بووە، لەگەڵیدا تەنانەت بۆ جارێکیش لە خانەی چاودێری کۆمەڵایەتی سەردانی نەکرد، یان نامەیەکی بۆ بنێرێت، یان هەندێك شیرینی وحەلوا تەنها لەبەر ئەوەی دڵی پێ خۆش بێت، بەڵام وا دەردەکەوت دایکی تەواو ئەوی لەبیر کردبێ، کەچی سەرەرای ئەوەی دایکی بەهیچ شێوەیەك سەردانی ناکردو هیچ هەواڵێکی نەپرسی، بەڵام

سامییە لە لای خۆیەوە بێ هیوا نەبوو لەوەی دایکی بۆ جارێکی تر ببینێتەوە، بەڵکو ئەو وێنەیەی کە بۆ دایکی کێشاوێتی بەهەندێك وێنەی تر بیانگۆڕێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە دەستی بە گەڕان کرد بەدوای دایکیدا بە هیوای ئەوەی لە ژیاندا مابێ‌و جارێکی تر لە ئامێزی بۆ چەند ساتێك ئۆقرە بگرێت‌و داوای لێبوردنی لێ بکات بۆ ئەو هەموو ساڵەی کە تێپەڕی، بە بۆچوونی سامییە ئەڵێت ڕەنگە بەدرێژایی ئەو هەموو کاتە نەیزانیبێ لە کوێ یە، بەڵام خۆ ئەگەر بیویستایە ئەیتوانی بیدۆزیتەوە، چونکە خانەی چاودێری کۆمەڵایەتی لە وڵاتی ئێمە زۆر کەمە دواتر ١٤ ساڵ کەم نییە بۆ ئەوەی کەسێك بییەوێت جگەری خۆی بدۆزیتەوە، بەهەر حاڵ سامییە بەهیوای ئەوەی دایکی بدۆزێتەوە یەکەم هەنگاوەکانی گەڕانی دەست پێ کرد.

لەسەر شەقامی سەرەکی ها ئەوە پاسەکە هات . . . پاسەکە زۆر بە سستی ئەڕۆیشت وەك ئەوەی لەسەر دڵی ئەو بڕوات ئەوە بۆ یەکەم جارە سامییە حەز بکات وەك سارووخێك بڕوات‌و ڕێگاکان کورت بکاتەوە، ئەو کات حەزی ئەکرد بە چاو تروکاندنێك بگاتە شوێنی مەبەست، بەڵام داماوە نەینەزانی ئاکامەکەی چۆن ئەبێ ئەگەر بیزانی با هیوای دەخواست پاسەکە لە جێگای خۆی ڕابوەستایەو هەرگیز نەڕۆیشتایە، بەهەر حاڵ گەیشتە ئەو شوێنەی کە مەبەستێتی چەند ڕۆژێك لەم ماڵ‌و لەو ماڵ تا ماڵی دایکی دۆزییەوە.

کاتێك چووە ناو ئەو گەڕەکەی کە دایکی لەوێ نیشتەجێ بووە کابرایەکی میوە فرۆش لە سەر کۆڵانەکەیان بە نیگایەکی تاڵەوە سەیری کرد؟ سامییە وتی زەحمەت نەبێ کاکە ماڵی فلان نازانی؟

ئەویش دیسان بە چاوێکی سەیرەوە تەماشای کردوو پێکەنی‌و

دەستی بۆ ئەو باڵەخانەی درێژ کرد کە دایکی لەوێ بو وتی: تۆ لەگەڵی ئیشەکەی؟

سامییە وتی: نا. . . من کچیم. . .

سامییە رووی کردە باڵەخانەکەو دڵی زۆر بەخێرایی لێی ئەدا چەند هەنگاوێك ماوە بگاتە دایکی بیری لەوە ئەکردەوە ئەبێت چی رووبدا لەم چاوپێکەوتنەدا، ماوەی ١٤ ساڵ کەم نییە. سامییە زەنگی لێداو چاوەڕێی کرد. . . دایکی. . ئەوە کێ یە لە دەرگا؟ سامییە. . . منم سامییە. . . دەگای کردەوەو ژنێك هاتە بەردەگا لە تەمەنی ٤٠ ساڵدا ئەبوو ژنێکی جوان پاش چەند خولەك یەکتریان ناسییەوە دایکی زۆر نەگۆرا بوو بەلاّم سامییە ئەوکات منداڵ بوو بەلاّم ئێستا کچێکی قۆزو جوانە هەموو گەنجێك بە هیوایەتی. . .

بەم شێوەیە دایکی گرتیە ئامێزی هەر وەك چۆن سامییە پێشبینی ئەکرد، بەلاّم هەستی بەوە نەکرد ئەمە ئەو ئامێزە بێ کە ئەو بەدوایدا ئەگەڕێت، چونکە بەراستی گەرمی چاوپێکەوتنەکە گەرمییەکی ئەوتۆ نەبوو هەرگیز هەر بۆیە پرسیاری کرد ئایە من ناونیشانەکەم هەڵەکردووە؟ بێگومان نەخێر ئەی بۆ ئەبێ دایکم پاش ئەوەندە ساڵە ئەوها بێت بەرامبەرم . . .

سامییەی داماو وای ئەزانی ئەگەڕێتەوە ناو باوەشی دایکی، ئیدی ماڵئاوایی لە ناخۆشییەکانی ساڵانی رابردوو ئەکات، بەلاّم بە پێچەوانەوە دەرکەوت، لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو بۆ رۆژی دوای دایکی داوای لێکرد کاری لەشفرۆشی لەگەڵدا بکات هەر بۆیە راستەوخۆ پەیوەندی بە مووشتەریەکانیەوە کرد، تا بێن و کالاّیەکی نوێیان پێ نیشان بدات، کە هاتن هەموو لیك بە دەمیاندا ئەهاتەخوار

کامیان یەکەم جار دەست پێ بکات.

بڕوا بکەن ئەگەر بهاتایەو پێشتر دایك وباوکم نەدیتایە کچی خۆیان وەك کاڵایەك بفرۆشن قەت بڕوام نەدەکرد، چونکە بۆ چەند جارێك لە هەندێك سەرچاوەی باوەڕ پێکراوەوە ئەوەم بینیوە دایك بە دوای مووشتەریدا گەڕاوە بۆ کچەکەی خۆی( ئای خودایە خۆت ئاگاداری) بەڵی بینیومە دایك پیاوی هێناوە بۆ کچی کاری سێکسی لەگەڵدا بکات ئەو لەهەمان کاتدا وەك فلمێکی سینەمایی سەیری کردووە یان ئەویش لەگەڵ پیاوێکی تردا خەریك بووە. . ئای خودایە خۆت ئەزانی چ دایکێك کە منی بوو! ئەمە ئەبێ چ دایکێك بێت داوام لێ ئەکات لەگەڵیدا کاری لەشفرۆشی بکەم لە جیاتی ئەوەی جل وبەرگی بووکێنیم بۆ بکرێت و لە کوڕێکی خاوەن شەرەف و بە کەسایەتی مارەم بکات، کە چی داوای کارێکی لەو جۆرەم لێ ئەکات.

خودایە من بەدرێژایی ژیانم لە ژێر زەمینێکدا ئەژیام هەر چەندە دایك وباوکیشم لە ژیاندا مابوون، ئەبێ من چیم کردبێ تا سزاکەم بەم شێوەیە بێت؟! بۆ چی ئەبێت هەموو گورگەکان دەورم لێ بدەن و وەك نێچیرێك هەموویان ئەیانەوێت ڕاوم بکەن ؟!

باشە من لێرەدا چی بکەم ڕا بکەم؟ بۆ نا. . . چی منی بە دایکم بەستۆتەوە تەنها ئەوە نەبێ لەناو تەزکەرەکەم ناوی نووسراوە کە دایکمە. . ئێستا تەنانەت ئەو ناوەشم بەلاوە گرنگ نییە نامەوێت من باوکم و براکانم لە ژیاندا ماون ئەرۆم بەدوایاندا ئەگەڕێم . . .

بەم شێوەیە سامییە لە دایکی هەڵات و رووی کردە ماڵی مامی دوای ئەوەی کە زانی باوکی لەشێتخانەیە، بەڵام ئەوەی نەزانی خۆی هەر لە منداڵییەوە نەخۆش بوو یان دایکی شێتی کردبوو.

بەڵی خوێنەری ئازیز سامییە رووی کردەماڵی مامی بەهیوای ئەوەی لانەیەکی ئارام بێت لەگەڵ مامی ژیان بەرێتە سەر، بەڵام نەیتوانی لە دوو مانگ زیاتر لەوێ بمێنێتەوە ئەویش بەهۆی ئەوەی ئەوەی ژنی مامی زۆر ئازاری ئەدا بە قسەو جنێودان، غیرەی لێ ئەکرد، چونکە کچێکی جوان بوو بۆ نا مافی خۆیەتی ئەگەر دایک ئامادە بێت کچی خۆی کاری لەشفرۆشی پێوە بکات ئیدی تەواو. . . سامییە ماڵی مامیشی بەجێهێشت دوای ئەوەی فرمێسک بەچاوەکانی وەك نمەی باران ئەهاتە خوار، ئەم جارەیان دەستی کردە گەڕان بەدوای براکانیدا بەڵکو بیاندۆزێتەوە، ماڵی یەکێك لە براکانی دۆزییەوە پێشوازی لێ کرد لەگەڵیدا بژی سامییە پێوابوو ئیتر تەواو کەسێکی دۆزییەوە پارێزگاری لێ بکات لە دەستی گورگەکانی ئەم سەردەمە.

بەڵی شتەکانی کۆکردەوە بۆ ئەوەی ئیتر لەمەودوا لەگەڵ براکەیدا بژی ئەو قەرەبووی هەموو ناخۆشییەکانی رابردووی بۆ بکات، بەڵام نەیزانی ئەم شوێنەش بۆی ئەبێتە سەرەتای ناخۆشییەکانی تر. دڵ خۆشی سامییە زۆر کەم بەردەوام بوو .

شەوێك لە شەوانی مانگی شووبات براکەی لە دەرگاکەی دا ئەویش برایەتی دەرگای لێ کردەوە بزانێت چی ئەوێت زۆر بەنامەردانە هاتە ژوورەوە جلەکانی بەری دڕاندو کەوتە لێدانی داوای لێ کرد ئەمەوێت سنگت ببینم؟! بەڵام ئەو بەهەموو شێوەیەك ڕەتی کردەوە، بەڵام ئەو بەردەوام بوو لەسەر داواکەی خۆی‌و هەڕەشەی ئەوەی لێ کرد ئەگەر ئەم کارەی لەگەڵ نەکات ئەوا ئەبێت ماڵەوە بەجێ بێڵێت لەسەر شەقامەکاندا بژی. . . سامییە بڕوای نەکرد بەوەی کە گوێی لێ بوو ڕاستەوخۆ کەوتە سەر ئەرزوو هاواری کرد خوایە گیان خۆت ئاگاداری

چیم لێ ئەکەم خوایە لێیان قبوولٚ نەکەی!

سامییە لەو کاتەدا بە بیری هێنایەوە ئاخر تۆ برامی! ئەوەی کە داوای ئەکەیت حەرامە، بەلاٚم براکەی گوێی لەم قسانە ڕانەگرت ودەستی کردە پێکەنین وتی کەس هەیە نەزانێت حەرامەو کارێکی نایاساییە، زۆر دڕندانە هێرشی بۆ بردو هەموو جلەکانی دڕاند بۆ ئەوەی ئارەزووەکانی خۆی تیادا بەتالٚ بکاتەوە وەك ئەوەی ئەو بەشێك نەبێت لەو زۆر بێ ڕەحمانە گوێی لە نالەو هاواری نەگرت ئەوە بوو خوشکەکەی خۆی لاقە کرد( ئەوە ئەبێ چ مرۆڤێك بێت خودایە)

نازانم چون کەسێك ئەتوانێت ژنێکی ئاسایی ئیغتیساب بکات چ جا ئەگەر ئەو کەسە خوشکت بێت ئەو جۆرە خەڵکانە ئەبێت چ هەستێکیان هەبێ؟

پاش ئەم هەموو ناخۆشی یە سامییە روو بکاتە کوێ داوای کۆمەك لە کێ بکات؟ لەلای هاوسێکانی سکالاٚ بکات؟

یان ئەوانیش لەمان خراپتر ئەگەر برا بەو شێوەیە مامەڵە بکات ئیدی چی بە خەڵکی تر ئەڵێت؟.

بەم شێوەیە لە مالٚی برا تاوانبارەکەی هەلاٚت و نازانێت روو بکاتە کوێ چووە لای باوکی بەلاٚم نەیتوانی بە هیچ شێوەیەك یارمەتی بدات ئەو لە پێ کەوتوو بوو لە نەخۆشخانە، بێ سوود بوو.

سامییە بۆ دواجار چارەسەری دۆزییەوە لە کاتێکدا لە ناو پاس دانیشتوو بوو نەفەرێك بە تەنیشتیەوە لاپەڕەکانی رۆژنامەی هەڵدایەوە ریکلامێك لەسەر پەڕەی رۆژنامەکە سەرنجی ڕاکێشا ئەویش لەلایەن رێکخراوی ژنان بۆ نەهێشتنی توندو تیژی بلاٚو کرابۆوە ئەویش ناونیشانەکەی لە بەرکردو ڕاستەوخۆ رووی کردە ئەو رێکخراوەو

چیرۆکی خۆی بۆ گێڕانەوەو ئیدی ئەوانیش لە لای خۆیان هێشتیانەوەو پارێزگارییان لێ ئەکرد سەیرە هەموو گورگەکان ئەیانەوێت ئەم کچە بکەن بە ژەمێکی بەلەزەتی ئێوارەخوانێك، باشە پاش ئەو هەموو ناخۆشی یە سامییە چی بکات؟ کێ ئەیخوازێت بەتایبەتی پاش ئەوەی ئەگەر بزانێ لە لایەن برایەوە دەست درێژی سێکسی لێ کراوە؟ ئەگەر بەم شێوەیە لە ماڵێکدا بمێنێتەوە پرچی سپی بهۆنێتەوە ئەوا ئەو کات دەیان چاو سەیری ئەکەن و دەیان چیرۆکی سەیری بۆ دروست ئەکەن، بەلآم ئەگەر بییەوێت پەردەی کچێنی بگەڕێنێتەوە ئەوا ڕەنگە کوڕێکی بە ئەمەکی دەست کەوێت و لەگەڵی ژیان بەرێتە سەر.

بۆ ئەم مەبەستە هەڵسا سەردانی دکتۆری کرد کە چی دکتۆرەکەش داوای هەزار دۆلاری لێ کرد لەگەڵ ئەنجامدانی کاری سێکسی پێش لکاندنەوەی پەردەکە بەیەکەوە، بۆ نا... ئەگەر براکەی دەست درێژی لێ کردبێ ئیدی خەڵکی تر چی...

ئەمرۆ هەموو شتەکان کۆڕاوە پزیشك ودز لە یەك ریزدا کارئەکەن ئەگینا پزیشك ئەبێ کەسێکی باوەڕ پێ کراو بێ، بەلآم لەم سەردەمەدا ئەوانیش پەیامی خۆیان لە بیر کردووە.

ئێستا ئەم کچە ڕوو بەڕووی ڕەوشێکی زۆر خراب بۆتەوە ئەویش بێ کەسی و بێ لانە لەم جیهانە جەنجاڵەدا ماوەتەوە ئەگەر پرسیارێك لە خۆمان بکەین کێ لە ئێمە کچێك لەو جۆرە ئەخوزێت و پاش ئەوەی چیرۆکەکەی ببیستێ وەڵامان چی ئەبێ؟ بێگومان کەسمان جوورئەتی ئەوە ناکەین کچێکی لەو جۆرە بخوازین، بەتایبەتی پیاوی عەرەب زۆر کەم ژنی تەڵاق دراو ئەخوازێتەوە چ جا کچێك لاقە کرابێ و بێ کەس بێ

ڕەنگە کەسێك بیکاتە هاوسەری خۆی لە ژێر چەند ناوێکی جیاواز وەك لە ڕێی خوا یان گوناهە کەچی من وەك پیاوێك ئەڵێم ئەمانە هەمووی درۆن کەس لە بەر ئەو هۆکارانە نایخوازێت بەڵکو بەمەبەستی بەتاڵ کردنەوەی ئارەزووەکانی ئەیخوازێت یان لەبەر ئەوەی کچێکی جوانە.

# کچێکی ئەڵمانی لەبەر چاوی خەڵکی لاقە ئەکرێت و کەسیش هەوڵی ڕزگاربوونی نادا

لەبەر چاوی هەشت کەس لای کەمی لە ناوچەیەکی گشتیدا لە ویلایەتی شلێزفیج هولشتاین کچێکی ١٤ساڵ لاقە ئەکرێت و کەسیش هەوڵی ڕزگار بوونی نادا، لە کاتێکدا کچەکە بەرەو ماڵ ئەگەڕایەوە پیاوێك لە دواوە دەستی لێ ئەوەشێنێت و هەر لە هەمان شوێن لاقەی ئەکات ئەوانەی چۆنێتی دەست درێژێکەیان بینی هەموو مانایەکی ئازایەتیان لە دەست دابوو کە کەسیان نەیانتوانی دەستی یارمەتی بۆ درێژ بکەن و ڕزگاری بکەن پشکێنەری تاوانەکان راینهۆڵد بەم شێوەیە باسی لە دەست درێژێکە کرد.

بە پێی لێکۆڵینەوە سێ کەس لە ناو ماڵەکانی خۆیانەوە سەیری دەست درێژێکەیان کردووە و نەیانتوانیوە تەنانەت پۆلیسیش ئاگادار بکەنەوە، لە کاتی تاوانەکەدا باوکی کچە پەیوەندی پێوە کردووە ئەویش داوای کۆمەکی لێ کردووە بەر لەوە پەیوەندی بە پۆلیسەوە بکات.

## ئیدانەکردنی هاولاّتییەکی بەریتانی بە تۆمەتی هەڕەشەکردن لە کچێکی کەنەدی لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە

دادگای کەنەدی سزای زیندانی بەسەر هاولاّتیەکی بەریتانیدا سەپاند بە تۆمەتی هەڕەشەکردن و تۆقاندن لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە حوکمی زیندانیەکەشی دووساڵ بوو، شایەنی باسە تەمەن وناوی ئەم هاولاّتی یە بەریتانی یە کریستۆفەر کالّی تەمەن ٢٧ساڵە چەند جارێك لە ڕیگەی تۆڕی ئینتەرنێت و ناردنی نامەی هەڕەشەکرن بە فاکس.

پاش ئەوەی سەبارەت بە ئەنجامدانی ئەم تاوانە، کریستۆفەر لە بەردەم دادگادا ئامادە بوو، دانی بەوە دانا کە نامەی هەڕەشەکردنی بۆ چەند شوێنێکی تر ناردووە، کە پەیوەندی بەم کچەوە هەبووە وەك بانك و چەند کۆمپانیایەکی یاسایی و کۆمەڵێك شوێنی بازرگانی و هەتا تەنانەت بۆ دوو کڵێسای کە بەزۆری ئەو سەردانی ئەکرد، ئەویش بەناردنی چەند وێنەیەکی بە شێوەیەکی ڕووت و ناشرین کە لە چەند کاتێکی جیاوازدا گرتوویەتی.

هەرچەند کریستۆفەر ڕەوانەی داگا کرا، بەلاّم لە لێکۆڵینەوەدا دەرکەوتووە کە پێش چوار ساڵ لەمەوبەر هەدووکیان لە ژوورێك لە ژوورەکانی چات بەیەکتر ئاشنا بوون، ئەویش سەرەتا بەقسەکردن بووە لەسەر ئەدەب وشیعر دواتر لە پاریس یەکترییان بینیوەو پەیوەندییەکانیان پەرەی سەندووە گەیشتۆتە ئەو ئاستەی منداڵێکی لێ ببێت، بەلاّم لە دوایدا بۆی دەرئەوێت کە پیاوێکی دڕندەوە مرۆڤ دۆست نییە شایەنی ئەوە نییە مرۆڤ ژیانی لەگەڵ بەرێتە سەر.

# منداڵێکی میسری لە کاتی خەتەنەکردنیدا ئەندامی نێرینەی بە تەواوەتی لە دەست ئەچێت

نەخۆشخانەی ئەبوو تەشتی گشتی لە میسر لە کاتێکدا پزیشکەکانی سەرقاڵی خەتەنەکردنی منداڵان بوون، لە ناکاو تووشی حاڵەتێکی سەیر بوون، ئەویش ئەوە بوو باوکێك کوڕەکەی خۆی هێنابوو بۆ ئەوەی خەتەنەی بکات کە ناوی وەلید بوو، لەمیانەی ئەنجامدانی خەتەنەکردنەکەدا کە بەشێك لە پێستەکەی بری بوو کوڕەکە تووشی خوێن بەر بوونێکی زۆر بێ ئەندازە بوو، بەتایبەتی کاتێك پزیشکەکە لە دەستی دەرچوو بەشێك لە ئەندامی نێرینەی بڕی پزیشکەکە بەخێرایی هەوڵی ئەدا خوێنی بەشەکەی تری ڕابگرێت، بەڵام بە مەقەسەکەی دەستی بەشەکەی تریشی بڕی، کوڕەکە ڕاستەوخۆ ڕەوانەی چاودێری تایبەتی کرا، بۆ خێرا ڕاگرتنەوەی خوێنەکەی.

کاتێك ئەم حاڵەتە ڕوویدا باوکی کوڕەکە ویستی بکەوێتە سەر پزیشکەکەو هەر لەوێ تۆڵەی کوڕەکەی لێ بکاتەوە بەڵام بە ماوەیەکی کەم پیاوانی پۆلیس گەیشتنە نەخۆشخانەو بارودۆخەکەیان کۆنترۆڵ کرد پزیشکەکەیان ڕەوانەی لێکۆڵینەوە کرد، کوڕەکەش تا ئێستا لە ژێر چاودێریدایە.

# تاوانەکەی هەر دوو خوشکی میسری ریا وسەکینە وهەژاندنی کۆمەڵگای میسری

تاوانکاری ئەم دوو خوشکە میسری یە کە ناویان ریا وسەکینە بوو، زۆرێك لە مەڵپەرو مانشێتی گۆڤارو رۆژنامەکانی گرتبوەوە بە باس‌و قسبەی ناو ماڵ‌و چایخانەو شوێنە گشتییەکانی میسر، زۆرێك لەم بارەیەوە قسەیان ئەکرد، بەلأم ئێمە لێرەدا هەموو راستییەکان ئەخەینە روو بۆ ئەوەی خوێنەر راستی‌و دروستی رووداوەکە بزانێت ئەویش بەم شێوەیە:

ئێمە ئێستا لە نیوەی مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٠تین سەرەتا بەم ئاگادارییە گەڕان‌و بەدواداچوون دەستی پیٚ کرد.

هاولأتییەکی تەمەن ٤٠ ساڵ بە ناوی زەینەب حەسەن ئاگادار کردنەوەیەکی لە حوکمدارێتی پۆلیسی ئەسکەندەرییە تۆمار کردووە، باس لە ون بوونی کچەکەی ئەکات بەناوی نەزلە کە تەمەنی ٢٥ساڵە ئەم ئاگادار کردنەوەیە یەکەم ئاگادار کردنەوە بوو وەك کەیسێك لە شوێنە گشتییەکاندا سەبارەت بە کوشتنی ژنان تۆمار کرا. خاوەن ئاگادارییەکە ئەڵێت: کچەکەی نەزلە ئەوە بۆ ماوەی دە رۆژە ون بووە، دوای ئەوەی ژنێك سەردانی کردووە لەو کاتەدا ئەو جلی شۆردووە هەموو شتێك لە شووقەکەی وەك خۆی ماوە هیچ شتێك لە ماڵەکەیدا ون نەبووە، تەنها خۆی نەبیٚ بیٚ سۆراغە، دایکەکە سەبارەت بە ڕەنگ وڕواڵەتی کچەکەشی ئەڵێت: کچێکی باریکەلەیە بالأی مام

ناوەندەی،ڕەنگی ئاسمەرە ئاڵتوونێکی زۆری بە قەدەوەیە لەگەڵ هەندێ شتی نایاب وەك خڵخاڵ و زیوو. . دایکەکە گومانی لەوەکرد کچەکەی نەمابێ و کەسێك بە تەماحی ئاڵتوونەکانی کوشتبێتی.

حاڵەتی دووەم: جارێکی تر بەشێوەیەکی فەرمی دەزگاکانی پۆلیس لە ئەسکەندەرییە ئاگادار کرانەوە ئەویش لە ١٦ ئادار بوو لە لایەن هاولاتی مەحموود مەرسی یەوە ئاگادارییەك پێشکەش کرابوو، کە تیادا لایەنی پەیوەندیدارو حکومەت ئاگادار ئەکاتەوە کە خوشکێکی بەناوی زەنووبە حەرەم حەسەن بۆ ماوەیەکە ون بووە، لە پاش گەڕانێکی زۆر هیچ سۆراغێکی نازانن ئەوەی سەیر بوو لە ئاگاکردنەوەکەی ئەم پیاوەدا ئەوە بوو ناوی هەر دوو خوشکی میسری هێنا ئەویش ریبا و سەکینە بوو. هەروەها مەحموود ئەوەشی ڕاگەیاند ناتوانم گومان لەوان بکەم، بەلام لە کاتێکدا خوشکەکەم ئەچێتە دەرەوە بۆ کڕینی هەندێك پەیداویستی ماڵەوە لە ڕێگا چاوی بە سەکینەو خوشکەکەی ئەکەوێت و لەگەڵیاندا ئەڕواتەوە بۆماڵ و دواتر دیار نامێنێت.

لەگەڵ ئەوەی پیاوانی ئاسایش لە حاڵەتێکی سەرسوورماندابوون لە بەدەم ئەو هەموو ئاگادارییانەی کە لە لایەن هاولاتیانەوە تۆمار دەکرا، لە ئەنجامی ون بوونی کەس و کاریان سکالا و ئاگادارییەکان ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ڕوو لە زیاد بوون بوو، ئێمەش بە شێوەی چەند خاڵێك لێرەدا ئەیخەینە ڕوو ئەویش بەم شێوەیە:

یەکەم: کچێکی تەمەن ١٥ساڵ لایەنی پەیوەندیدار ئاگادار ئەکاتەوە لەوەی دایکی لەوکاتەی چاوی کەوتووە بە ژنێك کە سەکینەیە ئیدی دایکی ون بووە و هیچ سۆراغێکی نەماوە، هەروەها بەردەوام ئەبێت لە

قسەکانی و ئەڵێت دایکم باڵندە فرۆشە ناوی زەنووبەیە تەواو ون بووە.

دووەم: لە هەمان کاتدا پارێزەری پارێزگای ئەسکەندەرییە ئاگادارییەکی لە لایەن هاولاّتی حەسەن شەناوییەوە بە دەست گەیشت تیادا باس لە ون بوونی هاوسەرەکەی ئەکات بە ناوی زەنووبەوەیە کە بۆ ماوەی بیست رۆژە ون بووە، کەس سۆراغی نازانێت و خەڵکیش هەر یەك بە شێوەیەك قسەی لە بارەوە ئەکەن. تا بەدەست گەیشتنی ئەم ئاگادارییە هیچ کەس نازانێت تاوانبار کێیە لە ون بوونی ناوبراواندا.

سێیەم: بۆ جارێکی تر پارێزەی پارێزگای ئەسکەندەرییە ئاگادارییەکی تری بەدەست دەگات ئەویش لە لایەن هاولاّتی محمد أحمد ڕەمەزانەوەیە باس لە ون بوونی فاتمەی هاوسەری ئەکات کە تەمەنی ٥٠ ساڵە لە یەکێك لە دووکانەکان کار ئەکات، ئەوکاتەی چۆتە دەرەوە ٥٤ جنێهی میسری پێ بووە،جگە لەو ئاڵتوون و بازنانەی کە لە دەستی کردووە نزیکەی هەشت بازنی بە دەستەوە بووە، مێردەکەی ڕەنگ و ڕواڵەتی هاوسەرەکەی باس ئەکات ئەڵێت: ئافرەتێکی بالاّ بەرزی گەنم ڕەنگە چاوێکی کوێرە هەر بۆیە خەڵکی پێیان ئەوت فاتمە کوێر ئەوکاتەی کە لە ماڵەوە دەرچووە جلێکی ڕەشی لە بەر بووە، قاچەکانیشی حیجلی پێوەیە .

چوارەم: ئاگادارییەکی تر دەگاتە دەستی پیاوانی پۆلیس ئەویش بەهەمان شێوە هاولاّتییەك باس لە ون بوونی کچێکی تەمەن ١٣ ساڵ ئەکات کە ناوی قەنوعە عەبدولمەوجوودە، لەو ئاگادارییەدا لایەنی پۆلیس ئاگادار ئەکاتەوە لە هۆکاری ون بوونی کچەکەی و گەڕان بە دوایدا.

پێنجەم: وەدیع جەرجیس بە هەمان شێوە لایەنی پەیوەندیدار

ئاگادار ئەکاتەوە لە ون بوونی کچێکی تەمەن ١٢ساڵ لە کاتێکدا چۆتە دەرەوە بۆ کڕینی کۆمەڵێك شت وەك، بەڵام ونبووەو ئیدی نەگەڕاوەتەوە ماڵ.

ترس سەر هەموو ماڵێکی ئەو شارەی گرتبۆوە باس باسی تاقمی رفێنەری ژن بوو، هەموو ماڵێك لەو بارەیەوە گفتووگۆیان ئەکرد. . .
بەڵێ بەم شێوەیە ئاگادارییەکان لە لایەن هاوڵاتیانەوە بەردەوام بوو.

شەشەم: ڕاگەیاندنێکی تر لە لایەن هاوڵاتییەکەوە باس لە ون بوونی سەلیمە ئیبراهیمی ماست فرۆش ئەکات کە لە ماڵەکەیدا بە تەنها ژیاوە.

حەوتەم: جێگری پەرپرسی بەشی پۆلیسی ناوچەی لەبان بەرێز ئەلیوزباشی حەمدی لە لایەن هاوڵاتی خەدیجە حەرەم ئەحمدەوە کە فەرمانبەرە لە سەر کۆگای تەنتا بە ڕەگەز سوودانییە باس لە ون بوونی کچەکەی ئەکات کە ناوی فیردەوسەو ئەڵێت: کچەکەم بۆ ماوەیەکە ون بووە کاتێك ون بوو ٦٠ جنێهی پێ بوو لەگەڵ دوو بازنی گران بەها، چەند شتێکی بەنرخی تر هەر بۆیە داوا لە لایەنی پەیوەندیدار ئەکات هەوڵێك بدات بۆ دۆزینەوەی کچەکەی وە هەر کەسێکیش شتێك لەو بارەیەوە بەزانی تکایە ئاگادارمان بکاتەوە. دوا بەدوای ئەم هەواڵەش بەرێز حەمدی ئەکەوێتە گەڕان و لێکۆڵینەوە بە دوای تاوانباراندا، لە پاش هەوڵێکی زۆر ئەم جارەشیان دەرئەکەوێت بۆ دوا جار سەکینە لەگەڵیدا بووە، ڕاستەوخۆ بنکەی پۆلیس داوای سەکینە ئەکات هەر چەندە ئەمە بۆ یەکەم جار نییە لە پۆلیسەوە داوا بکرێت بەڵام ئەم جارەشیان گومانیان بۆ ئەو ئەچێت بۆیە داوای ئەکەن و لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا ئەکرێت، کە چی زۆر بە شێوەیەکی زیرەکانە توانی تەواوی گومانەکان لە خۆی دوور بخاتەوە هەر بۆیە دەزگاکانی پۆلیس و

ئاسایش هیچ ڕێگەیەك نەما نەیگرنە بەر بۆ دۆزینەوە تاوانباران هەموو هەوڵەکانیان بێ سوود بوو لە دۆزینەوەی تاوانباراندا، تەنها لایەن مایەوە بۆی بگەڕێنەوە ئەویش دادپەروەری ئاسمان بوو، تەنها مەگەر خۆی راستی و دروستی ڕووداوەکە دەربخات، ئەگینا لە دەستی مرۆڤدا نەمابوو، مەگەر خوای گەورە خۆی بە قوودرەتی خۆی تاوانباران ئاشکرا بکات هەموویان بگەنە سزای خۆیان و پەردە لەسەر ئەم چیرۆکە پر تراژیدیایە هەڵبداتەوە کە بێ وێنەیە لە مێژووی میسردا.

سەر لەبەیانی ١١دیسەمبەری ساڵی ١٩٢٠ بوو بەرێز ئەڵیوزباشا ئیبراهیم حەمدی بروسکەیەکی تەلەفۆنی لە لایەن هێزە گەرۆکەکانی پۆلیسەوە لە شەقامی ئەبی دەردائەوە وەرگرت تیادا ئاماژەیان بە دۆزینەوەی تەرمێکی نەناسراو ئەکرد لەسەر ڕێیەکی گشتی، هەروەها ئاماژەشیان بەوە کردبوو لەگەڵ تەرمەکەدا کۆمەڵێك هێسك و قژی درێژی لەگەڵ بووە، کە ئاماژە بەوە ئەکات ئەو کەسە ئافرەت بێت کە لە ناو کیسەیەکی ڕەشدا بوو، بەلاّم بە هیچ شێوەیەك ڕەنگ و ڕواڵەتی کەسەکە ناناسرێتەوە. سەبارەت بەدۆزینەوەی ئەو تەرمە ئەفسەری پۆلیس ئەگاتە ئەو شوێنەو قسە لەگەڵ یەکێك لە زبڵ فرێدەرەکان ئەکات بۆ زیاتر زانیاری زبڵ فرێدەرەکە ئاماژە بەوە ئەکات لە کاتێکدا ئەو خەریکی زبڵ فرێدان بوو ئەم تەرمەی لە ناو زبڵەکە دۆزیوەتەوە بەراستی ئەفسەری پۆلیس تووشی سەرسووڕمان بوو، سەبارەت بە دۆزینەوەی ئەم تەرمە داخۆ ئەبێت ئەم تەرمە لەو ئافرەتە ون بوانە بێت یان نا؟

لەو کاتەدا پیاوێکی چاوکز ئاگادارییەك ڕەوانەی کونسوڵی ئینگلیزی ئەکات بەناوی جۆن فیلیپس لە بەشی ناوچەی "ئەل لەباندا"

لە ئاگاداریەکەی ئاماژە بەوە ئەکات لە کاتێکدا ئەو خەریکی چاڵ هەڵقەندن بوو بۆ راکێشانی ئاوی ناوماڵەکەی لە ناکاو هەندێك هێسك وپروسکی ئادەمیزادێك ئەکەوێتە بەر قازمەکەی، بەڵام ئەو لە چاڵ هەڵقەندنەکەی خۆی بەردەوام ئەبێ هەتا بەتەواوەتی هەموو لاشکە ئەهێنێتە دەرەوە هەر بۆیە بە باشی زانیوە لایەنی پۆلیس لەم بابەتە ئاگادار بکاتەوە.

لە دوای گوێ بیستنی ئەم هەواڵانە مولازمێکی گەنج لە بنکەی پۆلیسی لەبان زۆر بە حەماسەتەوە بەدوادا چوون بۆ ئەم مەبەستە ئەکات، خۆی ئەگەیێنێتە ماڵی کابرا کە ٥٠ مەتر لە بنکەکەیانەوە دوورە. کاتێك ئەچێتە ماڵی کابرا ئەبینێ لەوێ ئەو خانووەی تیادا ئەژیت خانوویەکی پڕ تراژیدیایە لە کوشتن و قڕکردنی ژناندا، هەر چەند گەیشتن بە راستییەکان کارێکی ئاسان نییە، بەڵام ئەم کارە کارێکی مۆڤانەو ئایینی ونیشتیمانییە ئەگەر بێتوو لایەنی تاوانبار ئاشکرا بکرێت، هەر بۆیە ئەم گەنجە زۆر بە حەماسەتەوە گەڕانی دەست پێ کرد بۆ دۆزینەوەی تاوانباران، لە پاش گەڕانێکی زۆر دەرئەکەوێت ئەو خانووەی کە تەرمەکە تیادا دۆزراوەتەوە کابرایەك تیادا بە کرێ دائەنیشت بە ناوی محمد أحمد السمنی کە ژوورەکانی ژێرەوەی لە سەر حیسابی خۆی بە کرێ گرتبوو، بەڵام لە رابردوودا کەسانێکی تر جگە لە سمنی ژێرەوەیان بە کرێ گرتبوو وەك سەکینەی کچی عەلی هەروەها ساڵحی کوری سولێمان و محمد شەکیرە، بەڵام سەکینە بەتایبەتی ئەو ژوورەی گرتبوو کە تەرمەکە تیادا دەرکەوت بەم دواییە هەر وەك ئەفسەری ئازاو چاو نەترس لە میانەی گەڕان و پشکنیندا بەم راستییە گەیشتووە. جەنابی ئەفسەر ئەوەشی راگەیاند

سەکینە لەم ژوورەدا ماوەتەوە، بەلاًم لە دوایدا بە ئارەزووی خۆی بە جێی هێشتووە، کە چی هەر وەك هاوسێکانی ئاماژە ئەکەن کە سەکینە بۆ چەند جارێك هەوڵی داوە بگەرێتەوە، بەلاًم خاوەن خانووەکە ڕازی نەبووە، لە گەرانەوەی‌و پێی وتووە مەگەر لە سەر لاشەی من جارێکی تر بگەرێتەوە. . . بەڵێ خاوەن خانووەکە مافی خۆی بوو ڕێگری لە هاتنەوەی سەکینە بکات، چونکە تەنانەت هەموو هاوسێکانیشی لە هەڵسوکەوتی سەکینەوە ڕەفیقەکانی بێتاقەت ببوون، کارو پیشەی سەکینە ئەوە بوو کۆمەڵێك ژنی رووتی بیّ ڕەوشتی لە ماڵەکەی خۆیدا کۆئەکردەوەو پیاوی بۆ ئەهێنان . . بەڵێ بەم شێوەیە تەواو هاوسێکانی لە دەستی بێزار ببوون، لە کۆتاییدا ئەو ئەفسەرە گەنجەی کە لە سەرەتادا باسمان کرد، توانی بەماوەیەکی کەم تەڵ تەڵ گرێکان بکاتەوەو هەنگاو بنێت بۆ ئاشکرا کردنی تاوانباران، ئێستا ئەو دوو بەڵگەی بەهێزی بە دەستەوەیە ئەویش بەم شێوەیە: یەکەم: دۆزینەوەی تەرمێك لەسەر ڕێگایەکی گشتی کە پاشماوەکەی لە هێسك‌و پورسکی ئاماژە بۆ ئەوە ئەکات ژن بێت بەهێزترین بەڵگەش درێژی قژێتی.

دووەم: بۆیەکەم جار پەنجەی تاوان بۆ سەکینە درێژبکرێت هەر بۆیە دادپەروەری ئاسمان بە زووترین کات پەردەی لە سەر راستییەکان لابردو ئەویش ڕۆژ لە دوای ڕۆژ تەرم لە دوای تەرم ئەدۆزرایەوە هەر چەندە ڕەییا هەوڵی ئەدا سەکینە هەڵبخەڵەتێنی وسەکینەش بە پێچەوانەوە، چونکە دوونیا هەر بە میزاجی ئەوان نابیّ هەمووکات بۆیە قەدەری خوای باڵاً دەست فرمانی دا بوو ئیدی تاوانباران بگەن بە سزای خۆیان لە بەر چاوی خەڵکیدا بن بە پەندو عیبرەت.

دوای ئەوەی دوو لاشەی نەناسراو دەرکەوت مەفرەزاەکانی پۆلیس

بەسەر شەقامەکانی ئەسکەندەرییەدا ئەگەڕان بۆ دۆزینەوەی تاوانباران یان بیستنی هەواڵی زیاتر، هەر بۆیە بەم دواییە پیاوێك بە ناوی ئەحمەد بەرقی ئەوەی ڕاگەیاندو وتی: ماوەیەك بۆنی بوخوردێك لەژوورەکەی رەییاوە دەرئەچێت ئەمەش بەراستی گومانی بۆ دروست کردووم، منیش ئەمەویست ڕاستەخۆ پرسیاری ئەوە لە خودی خۆی رەییا بکەم، بۆ ئەوەی وەڵامم بداتەوە، کە چی کە پرسیارەکەم لێ کرد وتی: من ژوورەکەم بۆ هەندێك پیاو بە جێ ئەهێشت کە کاتێك ئەهاتمەوە تێبینی ئەوەم ئەکرد بۆنی بوخوردێك لە ژوورەکەمەوە ئەهاتە دەرەوە، رەییا ئەڵێت بەم قسانە گومانم لە خۆم دوورکردەوە وام لە ئەحمەد کرد بڕوام پێ بکات، هەرچەندە ئەحمەد سەرەتا سەری بۆ ئەلەقاند، بەڵام لە ناخیشەوە بڕوای پێ نەئەکرد، هەر بۆیە ڕاستەوخۆ خۆی ئەگەێنێتە لای ئەلیوزباشاو گومانەکەی دڵی بۆ باس ئەکات، هەر بۆیە پاش ئەوەی گومانەکەی بۆ باس ئەکات ڕاستەوخۆ هێزێك لە ئەفسەرانی پۆلیس بەخێرایی خۆیان ئەگەێننە ژوورەکەی رەییاو تووشی شتێکی لە ناکاوو سەرسووڕهێنەر ئەبن سەرۆکی هێزەکان "سەندەرە"یەك ئەبینێ (صندرە) (وەك سندووقێکی گەورە وایە لە دار دروست ئەکرێ شت و مەکی تیادا هەڵئەگیرێت، وەك قەڵەوێرەیەکیش بەکار ئەهێنرێت بۆ خەوتن) هەر بۆیە کاتێك ئەم سەندەرەیە ئەبینێ فرمان ئەکات بە چۆڵکردنی ژوورەکەو بەتاڵکردنی هەر چی شت ومەك هەیە لە ناوی پەیتا پەیتا زیاتر لە سەرەداوەکە نزیك ئەبێتەوە، کاتێك سندووقە گەورەکە لا ئەبەن ئەبینن ژێر سندووقەکە کون کراوەو ئەچێتە خوارەوە جەنابی سەرۆك فرمان ئەدا بە لابردنی، کاتێك دەست بە لابردنی بەشێکی ئەکەن بۆنی بۆگەنی هەموو ئەو ناوە پڕ ئەکات، تا ئەو

ئاستەی مرۆڤ لە پیسی بۆنەکەی خۆی پێ راناگیرێت، هێواش هێواش زیاتر هەڵئەکەنن لە ناکاو تەرمی ژنێك دەرئەکەوێت کاتێك رەیبیا ئەمە ئەبینێ تووشی دڵەراوکێ و ترس دێت، بەلاّم جەنابی ئەفسەری هێزەکان جارێکی تر فرمان ئەداتەوە بە زیاتر چاڵکردنی شوێنەکەو پارێزگاری کردن لە تەرمەکان وەك خۆی بمێنێتەوە بۆ ئەوەی لە بەشەکەیان رووداوەکان بە وردی بنوسێتەوە بانگی رەیا ئەکەن بۆ لێکۆڵینەوە، هێشتا ناگەنە ناو بنکەکەیان بنکەی پۆلیس ئاگاداری ئەکەنەوە لە دۆزینەوەی تەرمێکی تر هەوڵەکان بەم شێوەیە بەردەوام بوو لە ناکاو ئاگادار کرانەوە لە دۆزینەوەی تەرمێکی تر بۆیە ئیدی رەیبیا بواری ئەوەی نەما نکوولّی لەم تاوانەدا بکات.

لێرەدا کاتی ئەوە هاتووە دان بە هەموو تاوانەکاندا بنێت بەلاّم رەیبیا هەر هەوڵی ئەوەی ئەدات گومان و رووداوی تاوانەکان لە خۆی دووربخاتەوە، بەهەر رێگەیەك بێت، بۆیە دانی بەوە دانا کە ئەم بە هیچ شێوەیەك دەستی بەژداری نەبووە لە کوشتی ئەم ژنانەدا، بەڵکو ئەو دوو پیاوەی کە وەك هەموو جار ژوورەکەی بۆ جێ ئەهێشتن ئەوان دەستیان هەبووە لە کوشتنی ئەو ژنانە رەنگە ئەوان لە کاتێکدا من لەوێ نەبوومە هەڵسابێتن بە کوشتنی ژنان و دەفن کردنیان لە ژوورەکەی من . . بەڵی رەیبیا لە سەرەتادا بەم شێوەیە ئاماژەی بۆ شتەکان ئەکرد، رەیبیا بۆ ئەوەی تاوانەکە لە سەر خۆی لابدات ناوی ئەو دوو پیاوەی هێنا کە ژوورەکەی بۆ جێ ئەهێشتن وتی: ئەوانیش ناویان یەکەم: عەرابی دووەم: ئەحمەد ئەلجوودور بوون رەیبیا وتی من عەرابیم پێش سێ ساڵ لەمەوبەر ناسیوە لە رێگەی براکەمەوە، بەلاّم هەروەها لە رێگەی عەرابی یەوەش ئەحمەدم ناسیوە، مێردەکەی رەیبیا رقی لەم دوو

پیاوە ئەبۆوە، چونکە ئەیزانی یەکێکیان رەییای خۆش ئەوێت.

بەڵی بەم شێوەیە ڕەنگ وڕواڵەتی تاوانباران پەیتا پەیتا دەرئەکەوت گرێکانیش یەك یەك ئەکرانەوە، ئەو لووغزەی بە کەم کەس ئەدۆزرایەوە ئەوا ئەمڕۆ روو لە ئاشکرا بوونە، بەتایبەتی دوای ئەوەی لایەنی ئاسایش و پیاوانی پۆلیس توانیان خاوەن تەرمەکان بناسنەوە. دوای هەوڵێك بۆ ناساندنەوەی تەرمەکان توانرا ناوی کەسەکان بهێنرێت ئەوانەیش کە ئەمانە بوون: فیردەوس، زەنووبەی کچی علێوە، ئامینە.

هێشتا رەییا لە لێکۆڵینەوەدا بوو سەبارەت بە کوشتنی ئەم کەسانە کە چی لەناکاو پیاوێکی پیر هاتە لای برادەرانی پۆلیس ئەوەی پێ ڕاگەیاندن کە رەییا لە شوێنێکی تریش کاتی خۆی ژووری بە کرێ گرتووە ئەویش کە لە شاقامی سیدی ئەسکەندەر بووە، هەر بۆیە پۆلیس بەخێرایی ئەگەنە ئەو شوێنەو لێکۆڵینەوەکانیان دەست پێ ئەکەن، دڵنیا ئەبن لەوەی کە ژوورێکیان کاتی خۆی سەکینە تیادا نیشتەجێ بووە ئەوی تر رەییا لە ژوورەکەی سەکینەدا سندووقێکی لە هاوشێوەی خانووەکەی تری لێ یە، فرمان بە ماڵە تازەکە ئەکەن ئەو شوێنەیان بۆ جۆڵ بکەن بێ ئەرك بەهەمان شێوە ژێرەوەی سندووقەکە هەڵئەدڕن و ئەبینن یەك لە دوای یەك تەرم دەر ئەکەوێت.

وێنەکە ئێستا تەواو روون بۆوە ژوورەکان هەموو لاشەو تەرمی خەڵکی بێ تاوانی تیادا حەشار دراوە، لە هەموو ئەو ژوورانەی سەکینەو رەیان بەکرێ گرتبوویان وەك خانووی ژمارە٥ ، ماکۆریس ٣٨، عەلی بەگی گەورە ژمارە٨، گەڕەکەی ئەلنەجات ژمارە٦. ئەمە بۆ یەکەم جار توانرا ماڵەکەی سەکینە بپشکێنرێت ئەمەش وای کرد پیاوانی پۆلیس بە گروتینێکەوە هەوڵ بدەن بۆ زیاتر کۆکردنەوەی

زانیاری بۆ ئەوەی ئەم کەیسە لە دەستی دادگادا ئەوها بە ئاسانی تێنەپەڕێت هەر بۆیە سەرجەم ئەفسەرەکانی لێکۆڵینەوە روو ئەکەنە ماڵی تاوانباران و لێکۆڵینەوەی زیاتریان لەگەڵ ئەنجام ئەدرێت. موولازم ئەحمەد عەبدوڵلا کە لە هێزی لێکۆڵینەوە بوو توانی لە ماڵی تاوانباراندا کۆمەڵێك ئاڵتوون وێنەو کۆمپیالەی سەدو بیست جنێه بە تایبەتی لە ماڵی تاوانبار عەرابی حەسەندا هەروەها کۆمەڵێك بەڵگەو شتی زانیاری بەخش.

موولازم عەبدولغەفووری گەنج لە گەڕان بە دوای تاوانباردانـدا پشووی زۆر درێژ بوو بە هەموو شێوەیەك لە هەوڵەکانی خۆی سارد نەبۆوە، جارێکی تر پرۆسەی هەڵکەندنی دەست پێ کردەوە لە ژوورەکەی رەییادا تەرمێکی تری دۆزیەوە لە پاش دۆزینەوەی ئەم تەرمەش هەواڵێك ئەگەیێنرێتە بنکەی پۆلیسی لەبان تیادا باس لەوە ئەکەن رەییا لە خانویەکی تریشدا جێنیشین بووە ئەویش لە ناوچەی کەرمووز سەبارەت بە هۆی جێ هێشتنی رەییا لەو ناوچەیەدا ئەنجوومەنی ناوچەکە ئەڵێت: رەییا بۆیە ئەم ناوچەیەی بە جێ هێشت بە پاساوی ئەوەی خەڵکی ئەم ناوچەیە رەوشتو سوومعەتیان تەواو نییە هەر بۆیە پۆلیس بە خێرایی پیاوەکانی خۆی پێ ڕائەگەیێنێت روو ئەکەنە ناوچەی کەرمووز لەوێ لە ژوورەکەیدا بە هەمان شێوە دەست ئەکەن بە هەڵقەندن لەویش تەرمێکی تر ئەدۆزنەوە.

بەڵگەکان زۆر بەهێزن بەهێزترین بەڵگەش ئەوە بوو عەبایەکی نەبەویەی کوژراو لە ماڵەکەی سەکینەدا دۆزراوەتەوە هەر چەند دواتر سەکینە هاشای لەوە ئەکرد هەوڵی ئەدا پیاوانی پۆلیس هەڵبخەڵەتینێ بەوەی کلتوورو داب ونەریت وڵات وایە ژنان لەناو یەکتردا عەبای یەکتر

ئەگۆرنەوە بۆیە ئەو عەبایەی ئەو راستەی لای من بووە، بەلأم منیش عەبایەکم داوە بەو بۆیە ئەمە هیچ پەیوەندییەکی بە کوشتنیەوە نییە. بەلێ بەم شێوەیە رەییا وسەکینە لەبەردەم دادگاو لێکۆڵینەوەدا ئامادە بوون دانیان بە هەموو تاوانەکاندا نا بە هەماهەنگی چەند کەسانێکی تر ئەنجامیانداوە بۆ نموونە ئەچوون ئافرەتیان هەڵەخەڵەتان بۆ ئەوەی بە بەهانەی شتێك بیانبەنەوە بۆ ماڵەوە ئیدی پاش رووتکردنەوەیان لەگەڵ کۆمەڵێك پیاو لە ماڵەکەیاندا سەریان ئەبرین هەر لە هەمان ماڵدا ئانخستە ژێر خاکەوە. سەکینە ئەڵێت من هیچم لەم کارانە نەئەزانی رۆژێك قاچم ئازاری هەبوو رەیا وتی ئەزانی خانمی هاوسێمان ئاڵتوونێ زۆری کڕیوە وەرە با لێی بسەنین و بۆ خۆمان بیبەین ئەویش وتی باشە کاتێك گەیشتینە ماڵی رەییا مێردەکەی خۆم بینی عەبدولعال وحەسەب وڵلا مێردی رەییا وهەروەها عەرابی و عەبدولرەزاق ژوورەکە تاریك بوو ومنیش هاوارم کرد کاتێك لاشەی خانم بینی مردبوو هەر دوو چاوەکەی کرابۆوە پیاوەکانیش لە ژوورەکە بەیەکەوە ئەرزیان بۆ هەڵئەکەنی کاتێك بینیان من هەست بە ترس ئەکەم وتیان ئێمە چوارکەسین هەشتیش لە دەرەوەیە ئەگەر بێتوو قسە بکەی ئەوا وەك ئەوت بەسەر دێنین منیش زۆر ئەترسام، بەلأم لەدڵی خۆمدا وتم: باشە من پەیوەندیم چی یە مادام ئەم تاوانە لە ماڵەکەی مندا نییە دواتر تەرمەکە خانمیان خستە ناوچاڵەکەوە وسێ جنێهێان بەمن دا چووم برینەکەی قاچم پێ چارەسەر کردوو ئەوی تریشم دایە سالۆن، هەر لە دڵی خۆمداه قسەم ئەکرد... وتم ئەمانە بۆیە بە من ئەڵێن قسە مەکە ئەیانەوێت بیمە شەریکیان لەم جۆرە کارانە بۆیە داوایان لێ کردم قسە نەکەم ئەگینا منیش ئەکوژن. سەکینە جگە لەم چیرۆکە ١٧ چیرۆکی

کوشتن ئەگێڕتەوە بەلاّم ئەوە دووپات ئەکاتەوە رەییا ئەو یەکەم جار تووشی ئەم کارانەی کردووە ئەویش لە بەرامبەر سێ جنێە بەڵێ هەر یەک لە تاوانباران چیرۆکی تاوانەکەیان ئەگێڕنەوە عەبولعال ئەڵێت ژیانی هاوسەریم دەست پێ کرد، بێ ئەوەی هیچ ئیرادەیەکم هەبێ ماڵەوە داوایان لێم کرد براژنەکەم بهێنم منیش هیچ ڕەخنەیەکم نەگرت، لە سەرەتادا نەمزانی گەورەترین خوێن مژ لە مێژووی میسردا لە خۆم مارە ئەکەم من چوار ساڵ لە ئامێزی سەکینەدا مامەوە، دوور لە دایکو باوکو کەس وکار، عەبولعال زۆ پەشیمان بوو لە زەواجەکەی و ئەڵێت: دایکم زۆر ئامۆژگاری ئەکردم بەلاّم هیچ کوێم لێ ڕانەدەگرت، تا گەیشتمە ئەمرۆ تا ئەو ئاستەی ئەم ژنە ملی منیشی بە پەتی سێدارە حەلاڵ کرد.

دادوەر تەواوی زانیاریەکانی سەبارەت بە تاوانباران بە دەست گەیشت بۆیە لە دانیشتنێکی کەم وێنەدا لە بەردەم چاوی هەزاران کەس لە خەڵکی میسر لە رۆژی ۱۰ئایاری ساڵی ۱۹۲۱ سەرۆکی دادگا ناوەرۆکی بەرزکردنەوەکەی خوێندەوە ئەمەش کە دەقەکەیەتی:

ئەم تاوانە یەکێکە لە خراپترین وقێزەونترین تاوانەکانو ئەمە یەکەم تاوانە لەم جۆرە بەم شێوەیە روویدات، چونکە هەتا تەنانەت ئەو خەڵکە کە ئامادە بوون ئەیانویست تاوانباران لە قەفەزی تاوان بهێنەدەرەوەو کوت کوتیان بکەم ئەوەن ڕقیان لێ بوون. هەر وەك ئاشکرایە ئەم باندە بۆ ماوەی سێ ساڵە پێك هاتووە، ئەم باندە خوێن مژە چەند ناوچەیەکی میسر ئەکەن سەکینە لە کچە بێ سوومعەتەکان بووە، بەلاّم بەردەوام نەبووە، لەبەر ئەوەی نەخۆشە بەلاّم پیاوەکەی لە ناوچەی کەفروزەناتدا گوایە لە لۆکە کار ئەکات، بەلاّم دەرکەوت هەر خەریکی

ئیشی تاوانکردن بووە. دوای ئەوە هەر دوو تاوانبار حەسەبوللاو عەبولعال سەفەریان کردو رەییاو سەکینەیان بە جێ هێشت لە پاش رۆیشتنی ئەوان سەکینەو رەییا رێك ئەکەون لە سەر ئەوەی دەرگای ماڵەکەیان بۆ کاری ناشرین بکەنەوە، ئەگەر بێتوو هەر کەسێکیش رێگرییان لێ بکات ئەوا عەرابیو عەبولرەزاق پارێزگارییان لێ ئەکەن بەڵێ، چونکە لە لێکۆڵینەوەکاندا دەرکەوتووە عەرابی پێشنیاری ئەوە ئەکات ماڵەکەی شەقامی عەلی بەگی گەورە بکەنەوە، بەڵام سەبارەت بە ون بوونی ژنەکان هەر کات یەکێکیان لە ناو بردایە ڕاستەوخۆ پولیسیان لێ ئاگادار ئەکردەوە لە ون بوونی ئەوانیش ئاگادارییەکانیان ڕەوانەی سەرەوە ئەکرد، بەڵام زۆر بەتەواوەتی شتەکان ناگەیشتە دەستیان بۆیە شتەکان لەو نێوەدانەدا ون ئەبوو، سەبارەت بەو کەسانەی کە ون ئەبوون یەکەم کەس کە ون بوو فیردەوس بوو رۆژی ون بوونەکەی ١٢نۆڤەمبەر بوو پولیس لە ون بوونی لە رۆژی ١٥ ئاگادار کرایەوە لە میانەی تۆمارکردنی کەسێك بە ناوی فیردەوسەوە هاوڵاتییەك بەناوی مەرسی لە جیرانی ماڵەکەی رەییادا چاڵی هەڵئەکەند بۆ ئەوەی ئاو ڕابکێشتێت بینی ئاسەواری لاشەی ئافرەتێك دەرکەوت ئەویش ڕاستەوخۆ خەبەری پۆلیس ئەدات لەبەردەم ئەم تاوانانەیان تاوانباران ئەبێ بە سزای خۆیان بگەن، بۆیە بەرێز دادوەر ناوەرۆکی سزاکانیان ئەخوێنێتەوە:

دادگا بڕیاری دا هەر حەوت تاوانبارەکەی یەکەم حوکمی لە سێدارەدانیان بۆ دەربکات کە لە نێوانیاندا رەییاو سەکینەی تیادایە هەر چەندە هۆکارەکان وای دەخواست چۆنێتی لە سێدارەدانیان لە دەرەوە بێتو لەبەر چاوی خەڵکی بێت، بەڵام ئەم شێوە سزادانانە بە

حەقی ئەوان لابردا بۆیە شوێنی لە سێدارەدانیان لە ژوورەوەی زیندان ئەبێت. بەلاّم سەبارەت بە سزا دانی تاوانبارانی تر ئەوا زیندانی ئەبەدیان بۆ بڕایەوەو زێڕنگرەکەش زیندانی شەش ساڵی بەسەردا سەپێندرا .

ئەمە ناوەڕۆکی بڕیارەکەی دادگا بوو لە دانیشتنە ئاشکراکەیدا لە دادگای ئەسکەندەرییەی ئەهلی لە ڕۆژی دووشەممە ١٦ی ئایاری ساڵی ١٩٢١ڕێکەوت س٨ ڕەمەزان ساڵی ١٣٣٩.

# تاوانی دەست درێژی سێکسی لە ناوهێزەکانی ئەمریکادا لە چ ئاستێکدایە؟

بێگومان هەر یەك لە ئێمە ئەو راستییە ئەزانی کە ئەمریکا تا سەدەی بیست ویەك چەندان ولآتی لە سەرتاسەری جیهان داگیر کردووە، لەبەرامبەردا دەیان وسەدان جەنگی بەرپا کردووە دژی دەیان میلەت و رەگەز، هەر بۆیە لەم راپۆرتەدا کە زۆر کەم وێنەیەو بەشێوەیەکی زۆر کەم دەست دەزگاکانی راگەیاند کەوتووە تیادا تیشك ئەخاتە سەر ئەو دەست درێژییە سێکسیانەی کە لەنێوان ریزەکانی سوپادا روویداوە.

ئەمریکا بالآ دەستە لەم جۆرە کارانە بەڵگەی زیدووش لەسەر ئەم راستییە جەنگی داگیر کردنی عێراق وئەفغانستان کە لە میانەی هەر دوو جەنگدا دەیان رووداوی لەو شێوەیە روویدا هەر چەندە ئەبوو دادگا سەربازییەکان ئەو کەسانە بە تاوانبار هەژمار بکات و سزای توندیان بەسەردا بسەپێنێ، بەلآم بە پێچەوانەوە بوو، چونکە دەست درێژی سێکسی بۆتە داب و نەریتی ئەمریکا هەر چەندە بۆش وەك سەرۆکێك شانازی ئەکات و ئەڵێت: سوپای ئەمریکا بە رەوشترین سوپایە لەجیهاندا !. بەم دواییە دەزگاکانی راگەیاندن سەبارەت بە دادگایی کردنی هەندێك لەو سەربازانە قسەو باسیان ئەکرد، بەتایبەتی ئەوانەی کە دەست درێژی سێکسیان کردە سەر ئەو کچە عێراقییەی کە زۆرێك لە ئێمە ئەو راستییەمان بیست کە دواتر کوشتیان و خێزانەکەشیان لەناوبرد، لەهەمان کاتدا کە باسی سیاسەتی سەبازی

ئەمریکی ئەکەن ئەڵێن ئەنجامدەری تاوانێك لەو جۆرە تەنها سزای لە سێدارەدانە بەڵام کوا؟ ئایە ئەمریکیەکان ئەتوانن ئەو کەسانە سزا بدەن بە پێی ئەو بەرنامەیەی کە بانگەشەی بۆ ئەکەن؟ بێگومان نەخێر.

راپۆرتەکە زۆر بە شێوەیەکی بابەتییانە بابەتەکە تاوتوێ ئەکات بەتایبەتی دیاردەی زیاد بوونی دەست درێژیە سێکسییەکان لە ریزەکانی سوپای ئەمریکادا بە تایبەتی بۆ سەر وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەراست.

بابەتی دەست درێژی سێکسی لە ناو کۆمەڵی ئەمریکیدا بە هەموو چین وتوێژەکانیانەوە یەکێکە لەو بابەتە زۆر بەربڵاوانەی وڵاتی ئەمریکا لە مەڕ ئەم بابەتە سەری سوور ئەمێنێت کە لە کوێوە دەست پێ بکات، لە دەست درێژیە سێکسییەکانی کە لە ناو قوتابخانەکاندا روو ئەدات یان لە یەکە سەربازییەکان یا لەناو دەزگاکانی پۆلیس وئاسایشدا یا لە نەخۆشخانەکاند یا لە فەرمانگە گشتییەکان و کۆمپانیاو چەندین شوێن وجێگای تردا، هەتا تەنانەت کۆشکی سبیش لە بابەتێکی لەم جۆرە ڕزگاری نەبوو، هەر چەند زۆرێك لەو دەست درێژیە سێکسیانەی کە لەناو کۆشکی سبیدا روو ئەدات بە شاراوەیی تا ئێستا ماوەتەوە.

سوپا ئەبێت یاسا تیادا سەروەر بێت، ئەوان لەهەموو شوێنێکی تر زیاتر ئەبێت یاسا پەیرەو بەکەن، بەڵام هێزی ئەمریکا بەوە ناچێ لە دەزگا مەدەنییەکان باشتر بێت، ڕوودانی دەست درێژی سێکسی لە ئەمریکا و وڵاتانی تر رۆژ لە دوای رۆژ روو لە زیاد بوونە بەڵگە لەمبارەیەوە زۆرە.

بۆ نموونە وەزارەتی بەرگری ئەمریکی بنتاگۆن لە ساڵی ٢٠٠٤ دانی بەوەداناوە کە زیاتر لە ١٧٠٠راپۆرتی بە دەست گەیشتووە سەبارەت بە

دەست درێژی سێکسی لە ناو یەکە سەربازییە ئەمریکیەکاندا.

سەرەرای ئەم رێژە زۆرە لە بەرامبەردا دەیان و سەدان راپۆرتی تر هەر بە شاراوەیی لە ژێر چەند ناونیشانێکی جیاوازدا ئەشاردرێنەوە، دوور لە چاوی بنتاگۆن و هەندێك کاتیش بە رەزامەندی هەر دوولایەن.

بەراستی ئەم رێژەیە زۆر کەمە بەبەراورد لەگەڵ ئەو هەموو دەست درێژییە سێکسیانەی کە لەناو سوپا وهێزی ئەمریکادا روو ئەدات. هەرچەندە وەزارەتی بەرگری ئەمریکی هەوڵێکی زۆری داوە ژمارەی راستەقینەی دەست درێژییەکان بشارێتەوە، بەلآم لە هەندێك رێگەوە هەر ئاشکرا ئەبێت، ئاشکرا بوونی ئەو حاڵەتە دەست درێژییانەش ئەبێتە مایەی شەرمەزای بۆ وەزارەتی بەرگری ئەمریکا، بۆ نموونە وەکو ئاشکرابوونی دەست درێژییە سێکسییەکەی تایهلۆك ئەو تاوانەی کە لە ساڵی ١٩٩١دا روویدا. هەروەها ئاشکرابوونی دەست درێژییە سێکسییەکان دژ بە راهێنەرە کچ و کورەکانی ئەبەردین کە لە ساڵی ١٩٩٦دا روویدا، یان ئەو دەست درێژییە سێکسییەکەی کە لە ئەکادیمیای هێزەکانی ئاسمانیدا روویدا لە ساڵی ٢٠٠٣.

ئاژانسی ئەسۆشەیتت پرێس لە بەرواری ٦مایۆی ٢٠٠٤ راپۆرتێکی هەواڵی بلآوکردەوە لە سەر دەست درێژییە سێکسییەکانی ناو سوپای ئەمریکادا، لە راپۆرتەکەدا هاتووە لێۆلەرەوانی سەربازی ئەمریکی نزیکەی ١٧٠٠ راپۆرتیان بە دەست گەیشتووە کە تیادا باس لە دەست درێژی سێکسی ئەکات لەناو ریزەکانی ئەمریکیدا، شایەنی باسە هەر یەك لەو راپۆرتانە پەیوەندی بە هەر تاکێکی ئەمریکییەوە بووە نەك بە شێوەیەکی گشتی رەوانەی وەزارەت کرابێت، ئاژانسی ناوبراو ئەوەشی راگەیاند کە وەزارەتی بەرگری ئەمریکی پێشووتر بایەخی بەم بابەتانە

نەداوە، بەلاّم وا دەرئەکەوێت بۆ یەکەم جار بێت ئامارێك لەو جۆرە پێشکەش بە وەزارەتی بەرگری بکرێت و تیادا باس لە دەست درێژی سێکسی لە هەموو یەکە سەربازییەکان بکات .

بەڵێ بێگومان هەر کەسێك یا هەر سەربازێك لە سوپای ئەمریکادا تووشی حاڵەتێك لەو جۆرە بێت ڕەنگە نەتوانی چیرۆکوکەی بخاتە بەردەم وەزارەت و سکالاّ تۆمار بکات، سەبارەت بەم راستییەش وتە بێژی فەرمی بەناوی بنتاگۆنەوە ئەڵێت: ئێمە هەزاران راپۆتمان لەوبارەیەوە بە دەست گەیشتووە ئەمەش ئامارژەیەکی روونە لە سەر بوونی ئەو حاڵەتە بە ڕێژەیەکی زۆر، جۆ ریچارد لەقسەکانی بەردەوام ئەبێت و ئەڵێت ئەندامانی بنتاگۆن زۆریان پێ خۆشە کاتێك سکالاّی سەبازەکانیان گوێ لێ ئەبێت ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سەبازەکانیان رۆشنبیر بوونەوە ئەتوانن بە دەست خۆیان دژ بە تاوانباران سکالاّ تۆمار بکەن.

ریچارد ئەڵێت من دڵنیام کە رێژەکە لەوە زیاترە، چونکە ئێمە نزیکەی ١-٥ملیۆن سەربازمان هەیە لە ریزەکانی سوپادا کار ئەکەن بێگومان ئەبێت ژمارەکە زیاتر بێت .

کەس بڕوا ناکات شێوەی مامەڵەکردنی سەربازی لەگەڵ تاوانباراندا بەم شێوەیە بێت، بەلاّم وەزارەتی بەرگری ئەمریکی ئەو جۆرە دەست درێژییە سێکسییانە بە شێوەیەکی ئاسایی لێك ئەداتەوە و ئەڵێت لە نێوان ئەو ١٧٠٠راپۆرتەی کە لە میانەی ساڵی ٢٠٠٤ پێشکەش بە وەزارەت کراوە نزیکەی ٣٥١راپۆرتیان بەڵگەی بەهێزیان بە دەستەوە نییەبۆچەسپاندنی دەست درێژێکان لە هەمان کاتدا هەندێك لەو حاڵەتانە تا ئێستا بە هیچ شێوەیەك کاری لەسەر نەکراوە لە بەرامبەردا

نزیکەی ٣٤٢حاڵەت تەنها برووسکەی ئاگادار کردنەوەیان پێ وتراوە.

سەبارەت بەم بابەتە ئانیتا شانچزی وتە بێژ بەناوی دامەزراوە فەرمێکان بۆ بەرگریکردن لە قوربانیانی توندوتیژی لە ئەمریکادا ئەڵێت: زۆر پێمان ناخۆشە دادگای سەربازی مامەڵەی نەرم بێت لەگەڵ ئەو تاوانبارانەی سکالایان لە دژ تۆمار کراوە بەڵکو ئەبێت بەشێوەیەکی دادپەروەرانە سزایان بدات لەبەر ئەوەی ئەم جۆرەکارانە تاوانە ئەمەش شتێکە کە گومانی تیادا نییە.

لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٤دا لە بەرواری ٢٠٠٤/١٢/٨ ئاژانسی (CNN)ی ئەمریکی چەند قسەیەکی هەڵبژێدراوی لە قسەکانی لیوا جۆزیف شێمتزی پشکێنەری گشتی لە وەزارەتی بەرگری ئەمریکیدا بلاوکردەوە، تیادا لیوا دان بەوەدا ئەنێت کە هەزاران حاڵەتی دەست درێژی سێکسی بوونی هەبێ لە ریزەکانی سوپای ئەمریکیدا هەروەها شێمتز ئەڵێت: رەگو ریشەی ئەو حاڵەتە دەست درێژییە سێکسییانەش لە ئاکادیمیای ئاسمانی کە لە میانەی دە ساڵی رابردوودا بۆ ئەوە ئەگەرێتەوە کە سەرکردەکانی هێزی ئاسمانی بەو شێوەیە هەستیان بە بلاوبوونەوەی ئەو جۆرە نەکردووە، بەم رێژە زۆرەی ئێستا شێمتز لە یاداشتێکدا کە پێشکەشی وەزیری بەرگری کردووە دۆناڵد رامسفێڵد هەست نەکردنی سەرکردەکانی هێزی ئاسمانی بە بوونی ئەو حاڵەتەو هەوڵ نەدانیان بۆ چارەسەرکردنی بۆتە هۆی زیاتر بلاو بوونەوەی.

هەروەها ئاماژەی بەوەش کردووە زۆربەی قوربانێکانیش بریتین لەو قوتابیانەی کە لە ئەکادیمیاکەدانو لە میانەی ساڵی ١٩٩٢بۆ ٢٠٠٣ بە رێژەیەکی زیاد روو بەرووی ئەم حاڵەتە بوونەتەوە.

ئاژانسەکە ئەوەشی راگەیاندووە کە لە ساڵی ٢٠٠٤دا وەزیری بەرگری ئەمریکی داوایەکی بەرزکردۆتەوە تیادا داوای لێکۆڵینەوە ئەکات سەبارەت بەو حاڵەتە دەست درێژییە سێکسییانە لە نێو ریزەکانی سوپای ئەمریکادا روو ئەدات.

ئاسان نییە کەسێك لێکۆڵینەوە بکات سەبارەت بەوەی لە ناو ریزەکانی ئەمریکادا روو ئەدات ئەمەش بۆ چەند هۆکارێك ئەگەڕێتەوە:

١- دەیان هەزاران سەربازی ئەمریکی ژن وپیاو لە چەند شوێنێکی چۆڵ و دوور ولاتدا ژیان بەسەر ئەبەن.

٢- زۆربەی ئەو حاڵەتە دەست درێژییە سێکسییانی روو ئەدات لە نێوان ئەفسەرە پلە بەرزەکانەوە ئەنجام ئەدرێن لەگەڵ ئەفسەرە پلە نزمەکان ئەمەش وا ئەکات ئەو حاڵەتانە بە شێوەیەکی شاراوە بمێنێتەوە.

٣- نەبوونی یاساو رێسای مۆراڵی لە ناو ریزکانی ئەمریکادا کە تیادا سنورێك بۆ ئەو جۆرە کارانە دابنرێت.

٤- گۆشەگیری سەربازە ئەمریکێکان لە ژیانی راستەقینەی رۆژانەوبەسەر بردنی ژیان دوورلە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان وەك نموونەی عێراق.

٥- شیکردنەوەی ئەخلاقی لە کۆمەڵی ئەمریکیدا بە شێوەیەکی گشتی و لە ناو سوپادا بە شێوەیەکی تایبەتی کە موومارەسەکردنی سێکس قەدەغەیەو نابێت لە ناو ریزەکانی سوپادا ئەنجام بدرێت لە کاتێکدا ئەوان لە ژینگەیەکی وادا پەروەردە کراوان کە سێکس و ئەو بابەتانەی تر ئاساییە.

٦- بوونی ئارەزووکردنی موومارەسەکردنی سێکس لە لایەن هەر

دوو لاوە هەژمارنەکردنی بە تاوان وچەند شتێکی تر.

٧- پشت گوێ خستنی ئەو ژمارە زۆرە لە سکاڵای سەبازەکان ئەویش لە لایەن بەرپرسانی سەربازییەوە.

٨- نەبوونی چاودێری ئەخلاقی لە کەرتی سەربازی ئەمریکیدا لە ناوەوەو دەرەوەی ولایەتەکانی ئەمریکادا.

٩- سزادانی تاوانبارانی ئەو حاڵەتە نایاساییانە بە شێوەیەکی نەرمو ئاسان کە ئەمەش ئەبێتە هۆی زیاد بوونی رێژە لە کاتێکدا ئەگەر هاتوو سزا کەم کرایەوە.

١٠- بە زۆر شاردنەوەی ئەو جۆرە حاڵەتانە لە لایەن وەزارەتی بەرگرییەوە رێگری کردن لە دەرچوون نووسینەوەی هەر جۆرە سکاڵایەك سەبارەت بەو کارانە.

لە راستیدا ئەمانە هەموو هۆکارن بۆ زیاتر بلاْو بوونی ئەو حاڵەتە.